بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

لە سۆنگەی هەست کردن بە پاداشتی بێ سنوور و نەبڕاوەی ژیانی دواڕۆژ ، وە گەورەیی ئەرکــی فێربوون و فێرکردنی قورئانی پیرۆز ، ڕێکخراوی ڕووناکی بۆ پەروەردەو فێرکردن و لەبەرکردنی قورئــانی پیرۆزهەستا بە ئامادەکردنی ئەم شێوازە لە بواری زانستی تەجوید وەك مەنـهـەج بۆقوتابیانی قورئان ، وە لە نووسینەوەیدا ڕەچاوی ئاستی تەمەن و توانای قوتابی لە قۆناغە جیاوازەکان کراوە کـــــــــە بە شێوازێکی نـــوێ و سادە بتوانن لێی تێبگەن .

هە روەها پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم لەم بارەیەوە دەفەرموێت : ( خيركم من تعلم القرآن وعلمه ) واتە باشتــرینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێردەبێت و کەسانی ترفێردەکات.

وە ڕوون و ئاشکرایە لای هەموان کە قورئان خوێندن لە هۆکارە زۆر گرنگەکانی نزیك بوونەوەیە لە سۆز و لێبوردەیی خوای گەورە وە فەرمان کراوە بە خوێندنەوەی :

یەکە م : پەروەردگار فەرمان بە خوێندنەوەی دەکات:﴿فَاقْرَءَواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقَرْآ نِ﴾المزمل ٢٠

واتە : قور ئان بخوێنن بەو ئەندازەیەی کە دەیزانن و تواناییتان هەیە .

دووەم : پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم فەرمان بە خوێندنەوەی دەکات ودەفەرموێت : ( إقرؤوا القرآن فإنه يأ تي يوم القيامة شفيعا لأصحابه ) رواه مسلم و اتە : قورئان بخوێننەوە چونکە قورئان لــــە دواڕۆژدا لەکاتی لێپرسینەوەی کردارەکاندا دەبێتە تکاکار و پارێزەری ئەوکەسەی کەبەردەوام هــــاوڕێی قورئان بووە.

داواکارین لە خوای بەدەسەلاَت یارمەتی دەری هەموو چاکە خوازێك بێت بۆگەیشتن بەڕەزامەندی خۆی هەرووەك دەفەرموێت :﴿ رَضِيَ الله عَنْهَم و رَضَوا عَنْهَ ﴾ وە هەر خۆشەویستێك سەرنج و تێبینی و زیادەیەکی هەیە بە سوپاسەوە سوودی تەواوی لێ وەردەگرین.

# تعريفُ القرآن

## پێناسەی قورئان

القرآنُ هو كلامُ اللهِ تعالَى ، العربيُّ، المُعجِزُ ، المُنَزَّل بِواسطةِ

**قورئان بریتیە لە فەرموودەی خوای گەورە ، بەزمانی عەرەبی( ڕوون ) ، دەسەوەسان کەر، لە ڕێی**

أمينِ الوحيِ جبريلٍ(عليه السلام) على محمدٍ(صلى الله عليه وسلم) .

**جوبرەئیل سەلامی خوای لێبێت بە وەحی هێنراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) ،

بِأحْرُفِهِ السبعةِ ، لفظاً ومعنىً ، المحفوظِ في الصدورِ ،

**بە حەوت حەرف ( واتە : شێواز) بە وێنە و دەنگی وشەکە و ماناکەی هەردوو بەیەکەوە ،لەبەرکراوە لەلایەن موسڵمانانەوە ،**

والمكتوبِ في المصاحفِ العثمانيةِ ،

**وە نووسراوەتەوە لە دەست نووسەکانی ئیمامی عوسمان ڕەزای خوای لێبێت ،**

برسمٍ يحتملُ ما بقيَ من أحرفِ السبعةِ و قراءاتِهِ المُتَعَدِّدَةِ ،

**بە نووسینەوەیەك كە لە خۆگری حەوت حەرفەکەیە (واتە : حەوت شێوازی خوێندنەوەکە ) وە جۆرەکانی خوێندنەوە ،**

والمنقولِ إلينا بالتواترِ ، والمُتَعَبَّدُ بتلاوتِهِ ،

**بە( تواتر) واتە بە بێ بچڕان گەیشتوەتە ئێمە نەوە لە دوای نەوە ،وە فەرمانمان پێکراوە کە ملکەچ بین لە خوێندنەوەیدا بە یاساکانی تجوید ( ترتيل ) نەك بە ویستی خۆمان ،**

والمُفْتَتَحُ بسورةِ الحَمْدِ ، والمُخْتَتَمُ بسورةِ الناسِ.

**وە بەسورەتی ( الفا تحه ) دەستی پێکردوە و بە سورەتی ( الناس ) کۆتایی هاتوە**

(الزرقاني / مناهل العرفان ١/٢١)



# ڕەوشتو ئادابەکانی قورئان خوێندن

١ ـ سوننەتە ڕوو لەقیبلە بکرێت، بەڵام خوێندنی قورئان بەپێوە و لەکاتی ڕۆشتنو بەدانیشتن و بەڕاکشانیشەوە دروستە.

٢ ـ دەست نوێژگرتنو سیواك کردنو هەڵبژاردنی کاتو شوێنی گونجاو و پاکو خاوێنی لەشو جلوبەرگ.

٣ ـ نیازپاکی (الإخلاص) بۆ خوای گەورەو دوورکەوتنەوە لەڕووپاماییو ناوبانگ پەیداکردن.

٤ ـ باشترکردنی خوێندنەوە تا ئەوپەڕی تواناو خوێندنی قورئان بەدەنگەوەو ووردبونەوە و تێڕامان لە واتای ئایەتەکانی.

٥ ـ نەپچڕاندنی خوێندنی قورئان مەگەر بۆ کاری پێویست نەبێت.

٦ ـ پەناگرتن بە خوداو، خوێندنەوەی قورئان بەلەسەرخۆییو بێ بەپەلەکردن تیایدا.

٧ ـ کڕنووش بردن لەکاتی خوێندن یان بیستنی ئایەتی (سجدە).

ئەم دوعایە دەخوێنین ﴿ سبحان ربي الأعلى ..سبحان ربي الأعلى .. اللهم لك سجدت و بك آمنت و لك أسلمت ، سجد وجهي للذي خلقه و صوره و شق سمعه و بصره بحوله و قوته تبارك الله أحسن الخالقين .. سبحانك اللهم و بحمدك اللهم اغفر لي ﴾

٨ ـ داواکردنی لێخۆشبوون لە گەیشتن بە هەر ئایەتێکی لێخۆشبوون.

٩ ـ تەسبیحات کردن لە گەیشتن بە هەر ئایەتێکی تەسبیح.

١٠ ـ پەناگرتن بەخودا لە گەیشتن بە هەر ئایەتێك کە باسی سزای خودا دەکات.

١١ ـ کارکردن بەفەرمانەکانی قورئانو دوورکەوتنەوە لەقەدەغەکراوەکانی.



# بنەماكانی زانستی تجوید

بەناوی خوای گەورە دەست دەكەین بە باس كردن و ڕوونكردنەوەی زانستی تەجو ید كە واتای جوان كـــــــردن دەگەیـــەنێـت لـــە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا ، وە ئەو زانستە فێرمان دەكات كە بە جوانی و بەیاسای تایبەت دەنگی پیتەكان لە قورئانی پیرۆزدا بخوێنینەوە ، كە یاساكانی بریتین لەم بنەما سەرەكیانەی لای خوارەوە :

بنەمای یەكەم : (شوێنی دەرچوونی پیتەكان ، واتە : مخارج الحروف )

هاوكات پێویستە ئەم سێ خاڵەی خوارەوەش دەربارەی پیتەكە بزانین :

١ ـ (وێنەی پیت ، واتە : الإملاء)

٢ ـ (ناوی پیت ، واتە : إسم الحرف)

٣ ـ (دەنگی پیت ، واتە : صوت الحرف )

بنەمای دووەم : سیفەتی پیتەكان (سیفەتە هەمیشەییەكان) ( صفات الحروف )

بنەمای سێیەم : یاسا تایبەتەكان بە هەندێك لە پیتەكان (الأحكام لبعض الحروف)

یاخود پێشیان دەوترێت (سیفەتە كاتیەكان الصفات العارضة)

وەك : ( إدغام ، إقلاب ، إظهار ، إخفاء ، مد ، قصر ، تفخيم ، ترقيق ، سكت ، تحريك ، سكون ، تسهيل ، إمالة ، الحذف و الإثبات ، ... )

إن شاءالله دواتر باسیان دەكەین .



# ناساندنی پیت(حرف) له پێنج خاڵی گرنگدا

**لەم وانەیەدا مامۆستا ئەم بابەتە بە ڕوونی باس دەکات کە کاتێك ئێمە دەمانەوێت قورئان بخوێنینەوە ، دەبێت بەشێوازێکی تەواو یاسای خوێندنەوەکە جێ بە جێ بکرێت ، کەواتە خوێنەری قورئان لەگەڵ دەنگ دا(الصوت) مامەڵە دەکات و پێویستە بە دروستی و دوور لە کەم و کورتی پیتەکان و وشەکان و وەك خۆیان بڵێت، بۆ یە لێرەدا پێویستە کە ئەم ڕاستیە بزانین کە (القرآن صوتٌ) واتە : (قورئان دەنگە) ، وە لە زمانی عەرەبیدا ژمارەی دەنگەکان (٢٩) دەنگن ، کە پێویستە دەربارەی ئەم دەنگانە ئەم زانیاریانەی لای خوارەوە لە لای قورئان خوێن ئاشکرابێت و بەجوانی بیانزانێت:**

**یەکەم : ( إملاء الحرف ، الصورة ، الرسم ) واتە : وێنەی پیت ، کە بریتیە لە وێنەی بچووکترین بڕگەی وشە کە پێی ی دەوترێت (الحرف) وە ئەمانەی لای خوارەوە وێنەکانیانن:**

( ء ، ب ، ت ، ث ، ج ، ح ، خ ، د ، ذ ، ر ، ز ، س ، ش ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ع ، غ ، ف ، ق ، ك ، ل ، م ، ن ، ه ، و ، ا ، ي )

**تێبینی: هەمزە (ء) بەم پێنج وێنەیە دەنووسرێت:**

**أ. (بەتەنها (ء) ، نموونە : (قراءة) ( السماء)**

**ب. لەسەر ئەلیف (أ) ، نموونە : (أحمد) ، ( أعوذ بالله)**

**ج. لە ژێر ئەلیف (إ) ، نموونە : (إنسان) ، (إبراهیم)**

**د. لەسەر (واو) ، نموونە : (رؤوف) ( مسؤول)**

**ه. لە سەر (ئ) لە ناوەڕاستدا ، نموونە : ( قائم) ( تائبون)**

**دووەم : (إسم الحرف) واتە : ناوی پیت :**

**( ء (همزة)، ب (با) ، ت (تا) ، ث (ثا) ، ج (جیم) ، ح (حا) ، خ (خا) ، د (دال) ، ذ (ذال) ، ر (را) ، ز (زاي) ، س (سین) ، ش (شین) ، ص (صاد) ، ض (ضاد) ، ط (طا) ، ظ (ظا) ، ع (عین) ، غ (غین) ، ف (فا) ، ق (قاف) ، ك (كاف) ، ل (لام) ، م (میم) ، ن (نون) ، ه (ها) ، و (واو) ، ا (ألف) ، ي (یا) )**



**سێیەم : (صوت الحرف) واتە : دەنگی پیت ، لە زمانی عەرەبیدا بۆ ئەوەی پیت دەنگی بۆ دروست بکرێت دەبێت یەکێك لەم چوار نیشانەیەی بۆ دابنرێت کە پێیان دەوترێت (العلامات للحرف) واتە : نیشانەکانی پیت ، کە ئەمانەن :**

**( ـُ ضمة وـَ فتحة و ـِ كسرة ) کە بەم سیانە دەوترێت (الحركة) واتە : جووڵەی پیت ، وە (ـْ) کە بەم دانەیەدەوترێت ( السكون) واتە : وەستاندن بە مەبەستی بێ جووڵە کردنی پیت . وە هەر چوار نیشانەکە بەخشەری دەنگن بە پیت بەتایبەت سێ حەرکەکە ، نموونە :**

**( بَ ، بُ ، بِ ) جووڵە بە سێ بەش ئەندازەی تەمەنی بۆ دیاری کراوە ، بۆیە هەرپیتێك پێویستی بەو سێ بەشەی تەمەنی هەیە تا بە جوانی ( إتقان) واتە : شێوازی تەواوی تیادا دەرکەوێت ودووربێت لە (الإختلاس : وتنی دوولەسەر سێ ی جووڵە) کەم و کورتی و ناتەواوی ، وە هەروەها پیتەکان لەکاتی ساکن بووندا (بْ) تەمەنی تایبەتیان هەیە کە لە باسی سیفەتەکانی پیتدا باسی لەسەر دەکرێت .**

**نموونە بۆ تەمەنی پیت لەکاتی جووڵەدار بووندا (المصوت القصير بَ ، بُ ، بِ ) :**

**(بَ ١ / ٢ / ٣ ) (بُ ١ / ٢ / ٣ ) ( بِ ١ / ٢ / ٣ )**

**کەواتە پێویستە لەکاتی وتنی هەرپیتێکدا ئەوسێ بەشە لەتەمەنی پیتەکە (زمن الحرف) بوترێت تا تەمەنی پیتەکە دووربێت لە دیاردەی ناتەواوی ( الإختلاس) وە (الإتقان) لە خوێندنەوەدا دەردەکەوێت .**

**چوارەم : (مخرج الحرف) واتە : شوێنی دەرچوونی پیت .دەبێت بەشێوازێکی دروست هەموو پیتێك لە شوێنی دەرچوونی خۆیەوە بوترێت .**

**پێنجەم : (صفات الحرف) واتە : سیفەتەکانی پیت . دەبێت بەشێوازێکی دروست هەموو پیتێك سیفەتەکانی خۆی پێ ببەخشرێت ، چونکە بنەمایەکی زۆر گرنگە بۆ جوان خوێندنەوەی قورئان ، وە لە باسی سیفەتەکاندا بەدرێژی باسی دەکەین إن شاءالله.**

## نیشانەکانی دەنگی پیت(العلامات للحروف العربیة)

لەزمانی عەرەبیدا چەند جۆرێکی جیاواز نیشانەمان هەیە ( العلامة) بۆ پیت کەئەم سیانیان پێیان دەوترێت جوولەی پیت ( حركة الحرف) کە ئەم سیانەن :

( ـُـ ضمة و ـَـ فتحة و ـِـ كسرة ) .

بەڵام چەند جۆرێکی ترنیشانەمان هەیە دەبێت بیانناسین کە ئەمانەی لای خوارەوەن :

١ـ ( ه ) سکونمان هەیە بە مەبەستی بێ جووڵە کردنی پیت .

٢ـ ( ّ ) شەدە مان هەیە بۆ توندکردن و گرتنی دەنگی پیت .

٣ـ ( ـٌـ دوو ضمة ، ـًـ دوو فتحة ، ـٍـ دوو كسرة ) مان هەیە کە پێیان دەوترێت (تەنوین) وە دە نگی نون دروست دەکەن لە هەندێ کاتی تایبەتدا .

بۆ زیاتر جێگیر بوونی زانیاریمان سەبارەت بە نیشانەکان ئەم خشتەیەی لای خوارەوە سەرنج بدە :

| نیشانە(العلامة) | ناوەکەی (إسمها) | کارەکەی (عملها) |
|---|---|---|
| ـُـ | الضَّمّة (بۆر) | جووڵەدارکردنی پیت بە گرد کردنەوەی شێوەی لێوەکان . بُ |
| ـَـ | الفتحة (سەرە) | جووڵەدارکردنی پیت بەکردنەوەی شێوەی لێوەکان بە شێوەی ئاسۆیی . بَ |
| ـِـ | الكسرة (ژێرە ) | جووڵەدارکردنی پیت بەشکاندنی شێوەی لێوەکان بەرەو خوار . بِ |
| ـْـ | السكون ( زمنە ) | بێ جووڵەکردنی دەنگی پیت . ءبْ |
| ـّـ | الشَّدة(توندکردن) | شەدە مان هەیە بۆ توندکردن و گرتنی دەنگی پیت |
| ـٌـ ـًـ ـٍـ | التنوین ( وتنی دە نگی نون) | ( ـٌـ دوو ضمة ، ـًـ دوو فتحة ، ـٍـ دوو كسرة ) مان هەیە کە پێیان دەوترێت (تەنوین) وە دە نگی نون دروست دەکەن لەهەندێ کاتی تایبەتدا . نموونە : (سماءٌ ، سماءً ، سماءٍ) |

# خشتەی پیتەکانی زمانی عەرەبی کە ٢٩ پیتن:

| وێنـەی پیت ( الإملاء) | ناوی پیت (إسم الحرف ) | دەنگـــــی پیت (صوت الحرف ) بە دانانی: ـُـ ضمة وـَـ فتحة و ـِـ كسرة |
|---|---|---|
| ء | همـــزة | ءَ ءُ ءِ تێبینی: همزە بەم پێنج وێنەیە دەبینرێت ( ء ، أ ، إ ، ؤ ، ئـ) |
| ب | با | بَ بِ بُ |
| ت | تا | تَ تِ تُ |
| ث | ثا | ثَ ثِ ثُ |
| ج | جيم | جَ جِ جُ |
| ح | حا | حَ حِ حُ |
| خ | خا | خَ خِ خُ |
| د | دال | دَ دِ دُ |
| ذ | ذال | ذَ ذِ ذُ |
| ر | را | رَ رِ رُ |
| ز | زاي | زَ زِ زُ |
| س | سين | سَ سِ سُ |
| ش | شين | شَ شِ شُ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ص | صاد | صَ | صِ | صُ |
| ض | ضاد | ضَ | ضِ | ضُ |
| ط | طا | طَ | طِ | طُ |
| ظ | ظا | ظَ | ظِ | ظُ |
| ع | عين | عَ | عِ | عُ |
| غ | غين | غَ | غِ | غُ |
| ف | فا | فَ | فِ | فُ |
| ق | قاف | قَ | قِ | قُ |
| ك | كاف | كَ | كِ | كُ |
| ل | لام | لَ | لِ | لُ |
| م | ميم | مَ | مِ | مُ |
| ن | نون | نَ | نِ | نُ |
| هـ | ها | هـَ | هـِ | هـُ |
| و | واو | وَ | وِ | وُ |
| لا | ألف | تێبینی: پیتی ألف پیتێکی هەواییە دەنگی نانوسرێت ،<br>بەدوو جۆر دەیبینین :<br>١ ـ ( ا ) ئەلیفی ممدود ، واتە :درێژ<br>٢ ـ ( ى )ئەلیفی مقصور ، واتە: کورت | | |
| ي | يا | يَ | يِ | يُ |

# پێناسەی تەجوید

**لە زمانەوانیدا ( في اللغة) : بریتیە لە ( التحسين ) واتە : جوان كردن ، چاككردن ، ( جوَّد يجوِّدُ تجويداً )دەوترێت ( جَوَّدَ الشيء ) واتە شتەكەی جوان كرد یا خود چاك كرد .**

**لە زاراوەدا (في الإصطلاح) : ( إعطاءُ كلِّ حرفٍ حقَّهُ و مُسْتَحَقَّه مَن مخرجٍ و صفةٍ و غنّةٍ و مَدّ ٍو ترقيقٍ و تفخيمٍ )**

**واتە : دەركردنی پیتەكانە لە جێدەنگی (مخرج) خۆیانەوە، بە پێدانی هەق و موستەهەقی هەر پیتێك ، لەڕووی مەخرەج و سیفەت و مینگە و مەد و باریك و قەڵەوكردنی دەنگی پیت .**

**هەقی پیت: ئەو سیفاتانەیە كە خۆیین و لە پیتەكە جیانابنەوە، واتە ئەو سیفاتانەیە، كە پیتەكە هەیەتی، وەك: شاردنەوەو ئاشكراكردن (الهمس والجهر)، بەرزی و نزمی (الإستعلاء والإستفال) و ... هتد**

**موستەهەقی پیت: ئەو سیفاتانەیە دەگرێتەوە كە كاتین، لە هەندێك كاتدا تووشی پیت دەبن و لە هەندێك كاتیشدا لێی جیادەبنەوە، وەك: ئاشكراكردن (الإظهار)، تێهەڵكێشكردن (الإدغام)، شاردنەوە (الإخفاء) ...هتد، واتە ئەو گۆڕانەیە كە بەسەر پیتێكدا دێت كاتێك دەگات بە پیتێكی تر.**

# ئامانج لە خوێندنی زانستی تەجوید

**ئامانج لەخوێندنی زانستی تەجوید بریتی یە لە پاراستنی زمان لە هەڵەكردن لەكاتی خوێندنی قورئان .**

# حوكمی خوێندنەوەی قورئان بە تەجویدەوە

خوێندنی قورئان بە تەجویدەوە فەرزی ( عەین ) ە لەسەر هەموو قورئان خوێنێك .

ئیبن جەزری دەڵێت :

والأخذُ بالتجويدِ حَتْمٌ لازِم    مَنْ لمْ يُجود القرآنَ آثِمٌ
لأنــَّه بِـــهِ الإلهُ أنــزلا    وهكذا مِنه إلينـا وصلا

واته : (( قورئان خوێندن به تەجوید واجب و پێویستە، هەر یەکێك قورئان به تەجوید نەخوێنێ گوناهبارە، لەبەرئەوە خوا به تەجوید ئەم قورئانەی دابەزاندووە، وە بەم شێوەیەش به تەجوید لەلایەن خواوە گەیشتوە به ئێمە )) .

## حوکمی فێربوونی زانستی تەجوید

حوکمی فێربوونی زانستی تەجوید فەرزی (کفایە)یە.

بریتییە لەوەی ئەگەر یەکێك یان کۆمەڵێك واجبەکەیان جێبەجێکرد، ئەوا خێرەکە بۆ ئەوانەو گوناح لەسەر ئەوانی تر نانوسرێ.

## قۆناغەکانی دابەزاندنی قورئانی پیرۆز

قورئانی پیرۆز به سێ قۆناغ دابەزیوە :

١ ـ لەلایەن خواوە بۆ ( **لوح المحفوظ** ) .

٢ ـ له (**لوح المحفوظ** )ەوە بۆ ( **بيت العزة** ) .

٣ ـ له ( **بيت العزة** ) ەوە بەهۆی ( جوبرەئیل ) ەوە دابەزێنراوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) به ( بەش بەش ) .

## پێغەمبەر (ﷺ)به چەند ڕێگا قورئانی گەیاندووە ؟

وەڵام : پێغەمبەر (ﷺ) به دوو ڕێگا قورئانی گەیاندووە :

١ ـ به نووسین ( **مكتوباً** ) : هەر کاتێك قورئان دابەزیایە، پێغەمبەر فەرمانی به نووسەرانی سرووش ( وحی ) دەکرد که بینووسنەوە، هەتا کاتی وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو قورئان نوسرایەوە .

٢ ـ به خوێندنەوە بەسەر هاوەڵاندا ( **منطوقاً** )، ئەوانیش گواستیانەوە بۆ دوای خۆیان . ئەم گواستنەوەیە به دەنگ ( **النقل الصوتي** ) به ( تواتر ) به ئێمە گەیشتووە .

تواتر: واته (گەیاندنی) گواستنەوەی تەواوەتی هەواڵێکە لەچینێکەوە بۆ چینێکی تر، لەیەکەم سەنەدی تا کۆتا سەنەدی، بەشێوەیەك ژیری و عەقڵ ناتوانێ بڵێ هەموو هەواڵگێڕەوەکان کۆببنەوە لەسەر درۆ.

# حوكمی ووتنی ( إستعاذة ) و ( بسملة ) له كاتی قورئان خوێندن دا

١ ـ وتنی ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ) له كاتی قورئان خوێندن دا :

حوكمەكەی : سوننەتە بۆ قورئان خوێن كە دەست بە قورئان خوێندن دەكات لە سەرەتای سورەت بوو یان لە سەرەتاكەی نەبوو بیخوێنێت.

وتراویشە (إستعاذة) لەكاتی دەستپێكردنی خوێندنەوەی قورئان واجبە، بە بەڵگەی ئایەتی(فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)(النحل: ٩٨) واتە: (هەر كاتێك قورئانت خوێند خۆت بپارێزە بە خوا لە شەیتانی دەركراو و دوورخراوە لە ڕەحمەتی خودا).

یەكێك لە شێوەكانی (إستعاذة) بەم جۆرەیە (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) (واتە: خۆم دەپارێزمو پەنا دەگرم بەخودا لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خودا).

لە سورەتی (توبە) ئەگەر لە یەكەم جار دەستت بە خوێندنەوەی كرد ئەوە تەنها (إستعاذة ) دەڵێیت.

خیلافیش لەوەدا نییە (إستعاذة) بەشێك نییە لە قورئان.

٢ ـ وتنی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) لە سەرەتای هەموو سورەتێك دا ( سوننەتێكی موئەكەدە ) یە، بێجگە لە سورەتی ( التوبە ) .

تەنها یەك شێوەیەی هەیە لە قورئان خوێندندا، ئەویش (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) ناكۆكی لەوەدا نییە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بەشە ئایەتێكە لە سورەتی (النمل).

لە مەزهەبی (حفص عن عاصم)دا (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) ئایەتێكە لە سورەتی فاتحەو هەموو سورەتەكانی دیكەی قورئان تەنها سورەتی (توبە) نەبێت. ئەگەر لە سەرەتای سورەت دەستت بە قورئان خوێندن نەكرد، ئەوا دەتوانی بیخوێنی و دەتوانیش نەیخوێنی .

## ( حاڵەت ) ـەکانی خوێندنی ( إستعاذة ) و ( بسملة ) و ( سوڕەت )

چوار بار ( حاڵەت ) ی هەیە کە ئەمانەی خوارەوەن :

١ ـ پچڕاندنی هەموویان :

واتە : کە ووتت ( اعوذ بالله من الشيطان الرجيم ) بوەستی، دوایی بڵێی (بسم الله الرحمن الرحيم) بوەستی ، ئینجا دەست بکەی بە خوێندنی ( سوڕەت )ەکە، ئەم بارە لەهەموویان باشترە .

٢ ـ گەیاندنی ( بسمله ) بە ( سوڕەت ) :

کە ( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ) وترا ، بوەستی، دوایی بڵێی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) و بەبێ وەستان ( سوڕەت ) ـە کەی لەگەڵ بخوێنی .

٣ ـ گەیاندنی ( إستعاذة ) بە ( بسملة ) و بوەستی، دوایی دەست بکەی بە خوێندنی سوڕەتەکە .

٤ ـ گەیاندنی هەموویان بەبێ وەستان .

## ( حاڵەت ) ـەکانی خوێندنی (بسملة) لە نێوان دوو ( سوڕەت ) دا

( بسملة ) لەنێوان دوو سوڕەت دا، چوار باری هەیە کە ئەمانەن :

١ ـ لەسەر هەموویان بوەستی : کە سوڕەتی یەکەمت تەواو کرد بوەستی، دوایی (بسم الله الرحمن الرحيم ) بڵێی و بوەستی، ئینجا سوڕەتی دووەم بخوێنی .

٢ ـ هەموویان بگەیەنی بەیەکتر بەبێ وەستان .

٣ ـ گەیاندنی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) بە سوڕەتی دووەم :

واتە کە سوڕەتی یەکەمت تەواوکرد بوەستی، دوایی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) بڵێیت و بەبێ وەستان سوڕەتی دووەم بخوێنی .

٤ ـ گەیاندنی کۆتایی سوڕەتی یەکەم بە ( بسملة )ی سورەتی دوای خۆی و بوەستی، ئەم حاڵەتەیان جائیز نییە .

## جۆرەكانی هەڵە ( اللحن ، الخطأ) لەكاتی قورئان خوێندندا

دوو جۆر هەڵە هەیە لەكاتی قورئان خوێندندا :

یەكەم : هەڵەی ئاشكرا ( اللحن الجلي ) :

بریتییە لە هەڵەكردن لە خوێندنەوەی پێكهاتەی ووشەكە ، كاریگەری هەبێت لەسەر ماناكەی یان كاریگەری نەبێت ، وە هەڵەكە ئاشكرایە لەلای شارەزا لە ئەحكامی تەجوید یان نەشارەزا پێی ، وەكو ئەوەی ( فەتحە ) ی ووشەی ( أنعمتَ ) بكەیت بە ( ضمة ) :

أنعمتَ ........أنعمتُ ، بەكۆی ڕای زانایان هەڵەی ئاشكرا حەرامە .

دووەم : هەڵەی شاراوە (اللحن الخفي ) :

ئەم جۆرەیان تەنها ئەو كەسانە هەستی پێدەكەن كە شارەزان لە ئەحكامی تەجوید، بۆ نموونە : لەكاتی قورئان خوێندندا ( إخفاء ) یان ( مد ) یان ( مینگە ) تەرك بكەیت .

زانایان دەڵێن ئەم جۆرە ( مەكروهە ) ، وە گوتراویشە ( حەرامە ) .

## جۆرەكانی قورئان خوێندنەوە

بە سێ جۆر قورئان دەخوێندرێتەوە :

یەكەم : التحقیق : واتە خوێندنەوەی قورئان بە ( لەسەرخۆیی و پەلە نەكردن و ووردبوونەوە لەماناكەی ، لەگەڵ جێبەجێ كردنی ئەحكامەكانی تەجوید ) ، ئەمەیان باشترین جۆری قورئان خوێندنە .

دووەم : الحَدْر:واتە خوێندنەوەی قورئان بە پەلە، لەگەڵ جێبەجێ كردنی یاساكانی تەجوید.

سێ یەم : التَدویر :ئەم جۆرە خوێندنەوەیە مام ناوەندی یە ، واتە دەكەوێتە نێوان جۆری ( تحقیق ) و ( حدر ) ، لەگەڵ جێبەجێ كردنی یاساكانی تەجوید ، وە ئەم جۆرەش لەدوای( تحقیق )ەوەیە .

( ئیبن جەزری ) دەڵێت :

ويقرأ القرأنُ بالتحقيق معَ    حَدرٍ وتَدوير وكلٌّ مُتَّبَعْ

واتە : ( دروستە بەهەر سێ جۆرەكە قورئان بخوێندرێت ، بە ئارەزووی قورئان خوێن ) .

تەرتیل: بریتییە لە سیفەتی خوێندنەوەی پەیوست بە ئەحكامەكانی تەجویدەوە لە هەر سێ حاڵەتەكەی خوێندنی قورئاندا.

# (مخارج الحروف ) شوێنی دەرچوونی پیتەکان

پیتەکانی زمانی عەرەبی (٢٩) پیتن ، لە (١٧) شوێنی جیاوازەوە دەردەچن ، بەڵام پێش ئەوەی ئاماژە بەشوێنی دەرچوونی پیتەکان بکەین دەبێت بزانین دەزگای قسەکردن لە مرۆ ڤدا (الجهاز النطقي)لە پێنج شوێنی سەرەکی پێك هاتووە کە بریتین لە :

یەکەم : الحلق (گەروو)

دووەم : اللسان ( زمان )

سێیە م : الشفتان (دوولێوەکان )

چوارەم : الجوف ( بۆشایی ناو دەم و قورگ )

پێنجەم : الخیشوم ( کونە لووت لە ناوەوە )

تێبینی : ئەم پێنج شو ێنە سەرەکیە لەم وێنەیەی لای خوارەوە (وێنەیژمارە ١)دیاری کراون .




وێنەی ژمارە ( ١ )

وە بۆزانیاری زیاتری ئێوەی خۆشەویست لە وێنەی ژمارە دوو دا ، (١٧) شوێنەكەی دەرچوونی پیتەكان كە لەزانستی تجویدا پێی دەوترێت ( مخارج الحروف ) لەگەڵ پیتەكانیاندا دیاری كراوە .

بەم شێوەیەی لای خوارەوە دابەش كراون :

یەكەم : الحلق (گەروو) /بەسێ بەش دابەش بووە و (٣) سێ مخرجی هەیە/ پیتەكانی(٦) شەش پیتن .

١ ـ بەشی سەرەوە ( أدنی الحلق) ( غ ، خ )

٢ ـ بەشی ناوەڕاست ( وسط الحلق) ( ع ، ح )

٣ ـ بەشی خوارەوە ( أقصی الحلق) ( ء ، هـ )

دووەم : اللسا ن ( زمان ) / بەسێ بەشی سەرەكی دابەش بووە و (١٠) دە مخرجی هەیە ، پیتەكانی (١٨)هەژدە پیتن .

١ ـ كۆتایی زمان ( أقصی اللسان) ( ق ، ك )

٢ ـ ناوەڕاستی زمان ( وسط اللسان) ( ي ، ش ، ج )

٣ ـ پێشەوەی زمان ( طرف اللسان) ( ن ، ر ، ت د ط ، ص ز س ، ث ذ ظ ) ( ل )

هەروەها لە لێواری زمان ( حافة اللسان) لە أقصی اللسان تاكۆتایی طرف اللسان مخرجی پیتی ( ض) .

وە هەروەها لە لێواری زمان لە بەشی طرف اللسان تاكۆتایی طرف اللسان مخرجی پیتی ( ل) .

سێیە م : الشفتان (دوولێوەكان ) / دووبەشە /لێوی سەرەوە و خوارەوە / (٢) دوو مخرجی هەیە پیتەكانی (٤)چوار پیتن / بریتین لە ( ف ، و م ب )

چو ارەم : الجوف ( بۆشایی ناو دەم و قوڕگ ) / یەك بەشە /(١) یەك مخرجی هەیە /پیتە مەدییەكانی تێدایە ( ـَا ، ـُو ، ـِی )

پێنجەم : الخیشوم ( كونە لووت لە ناوەوە ) / یەك بەشە / (١) یەك مخرجی هەیە / جێگەی دروست بوونی مینگەیە ( الغُـنَّة )

الخيشــــوم
طرف اللسان
أقصى حافتي اللسان
أقصى اللسان
الشفــــتان
أدنى الحلق
وسط الحلق
أدنى حافتي اللسان
أقصى الحلق
وسط اللسان

وێنەی ژمارە (٢) شوێنی دەرچوونی هەموو پیتەکان

# چۆنیەتی زانینی شوێنی دەرچوونی پیتەکان

**ئەگەر بمانەوێت شوێنی دەرچوونی پیتێك بزانین ئەوە پیتەکە سکوندار یان شەددەدار دەکەین‌و هەمزەیەکی حەرەکەداری لە پێش دادەنێین‌و دەیخوێنینەوە، دەنگەکە لە کوێ تەواو بوو ئەو شوێنە شوێنی دەرچوونی پیتەکەیە وەك:** (أَبْ، أَبّْ، أَقْ، أَقّْ، أَمْ، أَمّْ، أَجْ، أَجّْ) **بەم جۆرە دەتوانرێت شوێنی دەرچوونی هەموو پیتەکانی بە تەواوی بزانرێت.**

**بەڵام ئەم ڕێگەیە ئەو پیتانە ناگرێتەوە کە لە (جوف) دەردەچن، واتە پیتەکانی (مد) کە ئەمانەن** ( ـَـ اْ، ـُـ وْ، ـِـ يْ ) .

حروف الهجاء

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ء | ب | ت | ث | ج |
| ح | خ | د | ذ | ر |
| ز | س | ش | ص | ض |
| ط | ظ | ع | غ | ف |
| ق | ك | ل | م | ن |
| هـ | و | ا | ى | |

# باسی شوێنی دەرچوونی پیتەکان

## یەکەم : (الحلق) گەروو

سێ (٣) شوێنی دەرچوون (مخرج)ی هەیەو شەش پیتی لێ دەردەچێت، کە بریتین لە ( ء ، هـ ، ع ، ح ، غ ، خ ) ئەم شەش پیتە پیتەکانی حەلقیان پێدەوترێت.

ئەو پەڕی گەروو (أقصى الحلق) واتە ئەو بەشەی لە دوای سنگ دێت پیتی ( ء ، هـ ) لێ دەردەچێت، بەڵام هەمزەکە شوێنەکەی قوڵترە.

ناوەندی گەروو ( وسط الحلق) پیتی (ع ، ح ) لێدەردەچێت، بەڵام (ع) لە خوارترە.

نزیکترینی گەروو ( أدنى الحلق) کە دەکەوێتە لای دەم پیتی (غ ، خ ) لێدەردەچێت، بەڵام (غ ) لە خوارترە.

وێنەی نیشاندەری مەخرەجەکان و پیتەکانی ( الحلق )



## دووەم : (اللسان) زمان

ده (١٠) شوێن دەرچوون (مخرج)ی هەیەو (١٨) پیتی لێ دەردەچێت، كە بریتین له (ق، ك، ي، ش، ج، ض، ل، ن، ر، ت، د، ط، ص، س، ز، ث، ذ، ظ).

**پێش ئەوەی باس لە مەخرەجی زمان بكەین باس لە ددانەكان و بەشەكانی زمان دەكەین. ئێمەی مرۆڤ (٣٢) ددانمان هەیەو دابەش دەبن بۆ:**

١ ـ أربع ثنايا (برِندەكان) : چوار (٤)ددانن لە پێشەوەی دەم، دوو لە سەروو، كە پێیان دەوترێت (الثنايا العليا)، دوو لە خواروو، كە پێیان دەوترێت (الثنايا السلفى)، كاریان پچڕاندنی خۆراكە .

٢ ـ أربع رباعيات (عەقلْ ددانەكان) : چوار (٤) ددانن دوو لەسەروو دوو لە خواروو، دەكەونە ئەم لاو ئەولای (الثنايا) كارییان پچڕاندنی خۆراكە، یارمەتی (ثنايا) دەدەن.

٣ ـ أربع أنياب : چوار(٤) ددانن لە دوای رباعيات دێن، دوو لە سەروو دوو لە خواروو، سەریان تیژە ئەمانە هەڵدەستن بە پچڕاندنی گۆشت لەكاتی نان خواردن.

٤ ـ الأضراس : ئەمانە بیست (٢٠)ددانن لە دوای أنياب دێن، دە (١٠) لای سەروو پێنج لای ڕاست پێنج لای چەپ، دە (١٠) لای خواروو پێنج لای ڕاست پێنج لای چەپ، ئەمانە سەریان پانەو ڕەگێكی بەهێزیان هەیە، كاریان هاڕینی خواردنە، دابەش دەبن بۆ سێ بەش:

أ ـ أربع ضواحك : چوار (٤) ددانن لە دوای أنياب دێن، دوو لە سەروو لەم لاو لەولا، دوو لە خواروو هەیەكەو لەلایەك، بۆیە پێیان دەوترێت (ضواحك) چونكە لەكاتی زەردەخە بەدیار دەكەون.

ب ـ الطواحن : ژمارەیان دوازدە (١٢) ددانە شەشیان دەكەوێتە لای سەروو سێ لای چەپ سێ لای ڕاستو شەشییان دەكەوێتە لای خواروو سێ لای چەپ سێ لای ڕاست.

**ج ـ أربعة نواجذ : دەکەونە کۆتایی ددانەکان، دوو لە سەروو لای ڕاستو لای چەپ، دوو لە خواروو لای ڕاستو لای چەپ، ئەم چوار ددانە هیچ دەورێکییان نییە لە دەرچوونی هیچ پیتێك.**






## بەشەکانی زمان ( أقسام اللسان )



## باسی پیتەکانی (اللسان) زمان

### ١ ـ (ق)

**ئەوپەڕی زمان (أقصى اللسان) واتە کۆتایی زمان لەگەڵ مەڵاشوو یان ئاسمانەی سەرووی دەم لە بەرامبەری شوێنی دەرچوونی پیتی (ق)ە.**

**ئاسمانەی سەرووی دەم مەڵاشوو لە دوو بەش پێك هاتووە بەشی پێشەوەی ئێسكو ڕەقە، بەشی دواوەی گۆشتو نەرمە، شوێنی دەرچوونی پیتی (قاف) کۆتایی زمانە لەگەڵ بەرامبەری لە بەشە نەرمەکەی ئاسمانەی سەرووی دەم**

وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (قاف)



## ٢ ـ (ك)

**ئەوپەڕی زمان کەمێك لە دوای مەخرەجی (ق) واتە کەمێك بۆلای دەم دێت، لەگەڵ بەرامبەری لە مەڵاشوو ئاسمانەی سەرووی دەم مەخرەجی پیتی (ك)ە.**

**مەڵاشوو لە مەخرەجی (ك) هەندێك لە بەشە نەرمەکەو هەندێك لە بەشە ڕەقەکەی بەردەکەوێت.**

**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (کاف)**



## ٣ ـ (ي) (ش) (ج)

**ناوەندیزمان لەگەڵ بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم شوێنی دەرچوونی سێ پیتی (ی، ش، ج) بەمەرجێك پیتی (یا)ەكە مەددی نەبێت .**

**لەكاتی دەرچوونی (ی) زمان بەرزدەبێتەوە بەڵام ناگاتە ئاسمانەی سەرووی دەم، لەكاتی دەرچوونی (ش) زمان زیاتر بەرزدەبێتەوە، بەڵام ناگاتە مەڵاشوو، بەڵام لەكاتی دەرچوونی پیتی (ج) ناوەندی زمان دەنووسێت بە بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم.**

**تێبینی : پیتی (ج ) لە زمانی عەرەبی وەكو (ج)ی زمانی كوردی ناخوێندرێتەوە.**

وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی ( ي )



## وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ش)







## وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی ( ج )

## ٤ ـ (ض)

به لێدان و پاڵەپەستۆی یەکێك لەلا تەنیشتەکانی زمان بەلای چەپ یان ڕاستی خرێکانی لای سەروو شوێنی دەرچوونی پیتی (ض)ە، یان لێدانو پاڵەپەستۆی هەردوو لاتەنیشتی زمان لە یەك کاتدا لە هەردوو لای خرێکانی لای سەروو بەم شێوەیەش پیتی (ض) دەردەچێت، کەواتە دەتوانین بە سێ ڕێگا پیتی (ض) دەربڕین، بەڵام دەرچوونی پیتی (ض) بە لاتەنیشتی چەپی زمان لەگەڵ خرێکانی سەرووی لای چەپ ئاسانترەو زیاتریش بەکاردێت.

**خرێکان:** شازدە ددانن دەکەونە کۆتایی ددانەکان لەلای سەروو: چوار لای ڕاستو چوار لای چەپ، لە خوارووش چوار لای ڕاست چوار لای چەپ، بەمەرجێك چوار ددانی کۆتایی لێ دەربکەی (نواجذ)ەکان وەك گوتمان (نواجذ)ەکان هیچ ڕۆڵێك نابینن لە دەرچوونی هیچ پیتێك.

وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ض)



ڕەنگی زەرد: شوێنی بەرکەوتن
بەبێ فشار کردن
منطقة التلامس

ڕەنگی شین : شوێنی فشار
درووست کردن و پاڵ پێوەدان
منطقة الضغط و الإتكاء



## ٥ ـ (ل)

یەکێك لە قەراخەکانی پێشەوەی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە پووکی سەرووی دەم لە ئاستی ددانەکانی (ثنایا و رباعیات و أنیاب و ضواحك) جا لای ڕاستی سەرەوە یان لای چەپی سەرەوە شوێنی دەرچوونی پیتی (ل)ە.

پیتی (ل) بە پێچەوانەی پیتی (ض) ئاسانترە بەلای ڕاست دەریبکەیو زیاتریش لای ڕاست بەکاردێت.

وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ل)



من أدنىٰ حافَتَيِ اللِّسان

إلىٰ منتهىٰ طرفه



## ٦ ▪ (ن)

**پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ پووکی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە (الثنایا العلیا) شوێنی دەرچوونی پیتی (ن)ە، لەگەڵ دەرچوونی غوننەش لە خەیشووم.**

**پێشەوەی زمان طرف اللسان جیاوازی هەیە لەگەڵ سەری زمان رأس اللسان، لێرەدا کە دەڵێین پێشەوەی زمان مەبەستمان پێی سەر پشتی زمانە لە بەشی پێشەوەی زمان.**

**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ن)**



## ٧ ▪ (ڕ)

**پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ بەرامبەری لە پووکی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە شوێنی دەرچوونی پیتی (ڕ)ە بەڵام ئەمە لە مەخرەجی (ن) زیاتر بۆ لای پشتی زمان دەڕوات.**

**پیتی (را) بە گەورەیی‌و بەباریکی دەخوێنرێتەوە، لە هەردوو باریدا یەك شوێنی دەرچوونیان هەیە، بەڵام لەباری گەورەییدا ئەوپەڕی زمانیش بەرزدەبێتەوەو ناوەندی زمانیش قووڵ دەبێت‌و گەرووش تەکستر دەبێتەوە.**

**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ڕ)**



### ٨ ـ (ت) (د) (ط)

**پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ ڕەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوە شوێنی دەرچوونی سێ پیتە (ت، د، ط).**

**ڕەگی ددان مەبەستمان ئەو شوێنەیە کە ددانو پووك پێك دەگەن، جا ئەگەر پێشەوەی زمانت بە نەرمی لە ڕەگی دوو ددانی لای سەرەوە بدەی پیتی (ت) دەردەچێتو بەهێزتر لێی بدەیت (د) دەردەچێت، ئەگەر پشتی زمانت بەرزبکەیتەوە پێشەکەی لە ڕەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوە بدەیت (ط) دەردەچێت.**

**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ت ، د ، ط)**



### ٩ ـ (ص) (س) (ز)

**پیتی ( ص ، س ، ز ) دەردەچێت لە دەم بە دانانی کۆتایی پێشەوەی زمان، واتە سەری زمان لەسەر خوارووی ناوەوەی دوو ددانی پێشەوەی لای خوارەوە (الثنايا السلفى) جا دەنگ دەردەچێتو تێپەڕ دەبێت بە نێوانی دوو ددانی پێشەوەی سەروو خواروو ، بەڵام لەگەڵ پیتی (ص) دا پشی زمان بەرز دەبێتەوە .**

وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ص ، س ، ز )



## ١٠ ـ (ث) (ذ) (ظ)

**پشتی پێشەوەی زمان (طرف اللسان)و سەری دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە (الثنايا العليا) شوێنی دەرچوونی ئەم سێ پیتەیە (ث، ذ، ظ).**

**لەکاتی دەرچوونی (ث، ذ) زمان بەرز ناکرێتەوە بەڵام لەکاتی دەرچوونی (ظ) کۆتایی زمان بەرز دەکرێتەوە، لەکاتی دەرچوونی ئەم سێ پیتە زمان کەمێك دێتە دەرەوە لە نێوان ددانەکان.**

**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ث ، ذ ، ظ )**



## سێیەم :(الشفتان) دوو لێوەکان

دوو شوێن دەرچوون (مخرج)ی هەیەو چوار پیتی لێ دەردەچێت، کە بریتین لە (ف، و، م، ب) بەم چوار پیتەش دەوترێت پیتە لێوییەکان.

**١ - (ف)**

ناوەوەی لێوی خوارەوە لەگەڵ سەری دوو دانی پێشەوەی لای سەرەوە (الثنایا العلیا) پێکەوە دەنوسێندرێن بەڵام زۆر بە توندی پێکەوە نانوسێندرێن بە شێوەیەك بێت ماوەی ڕۆیشتنی هەوای هەبێت شوێنی دەرچوونی پیتی (ف)ە.

وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ف)



### ٢ ▪ (و) (م) (ب)

**نێوانی دوو لێوەکان سێ پیتی (و، م، ب) لێ دەردەچێت بە مەرجێك (و) واوی مەدی نەبێت.**

**دوو لێوەکان لەکاتی دەرچوونی (و) کەمێك دەکرێنەوە بە شێوەی کەوانەیی‌و ئەوپەڕی زمانیش بەرزدەبێتەوە، بەڵام لەکاتی دەرچوونی (م، ب) پێکەوە دەنوسێندرێن، بەڵام لەکاتی دەرچوونی (ب) توندتر پێکەوە دەنوسێندرێن‌و وەك لە (م) لەکاتی دەرچوونی (م)یش غوننەی لەگەڵدا دەبێت.**

**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (و)**






## وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی (ب)

ب / لێوی سەرەوە بە هاوکاری خوارەوە
لە نێوان هەردوو لێوەکەدا دێتە دەرەوە




م / لێوی سەرەوە بە هاوکاری خوارەوە
لە نێوان هەردوو لێوەکەدا دێتە دەرەوە










**وێنەی نیشاندەری مەخرەجی پیتی ( م )**

## چوارەم :(الخیشوم) کۆتایی لووت ، دەرگای نێوان سەرووی لووت و قوڕگ

بەرزترین بەشی لووت یان (ئەوپەڕی لووت)، ئەو دەرگایەیە کە بەرزترین بەشی لووت دەگەیەنێت بە گەروو، شوێنی دەرکەوتنی مینگە یان غوننەیە، واتە غوننە سەرچاوەکەی لەوێیە.

غوننەش لەگەڵ پیتی (م، ن) دەردەچێت ئینجا میم‌و نونەکە هەرچۆنێك بن (حەرەکەدار، سکوندار، شەددەدار، یان دەغم کراو).

وێنەی نیشاندەری غوننەی ( نون ) و ( میم )






## ٥ ـ (الجوف) بۆشایی ناو دەمو قورگ

**یەك مەخرەجی هەیەو سێ پیتی لێ دەردەچێت، كە پیتەكانی درێژكردنەوەن (حرف المد) ( ـَاْ ، ـُوْ ، ـِیْ )**

**پیتە مەدیەكان سیانن**

**١ ـ ئەلیف (ا) ساكن بێت و پێشەكەی (الفتحە – سەر) بێت . نموونە : سَـمَـــــا ءُ**

**٢ ـ واو (و) ساكن بێت و پێشەكەی (الضمة – بۆر) بێت. . نموونە : یــكُــــونُ**

**٣ ـ یا (ي) ساكن بێت و پێشەكەی (الكسره – ژێر) بێت . نموونە : علــِیـــــم**

**وێنەی نیشاندەری مخرجی(الجوف) بۆشایی ناو دەمو قورگ**



# ئەم خشتەیە بریتیە لە کورتەیەك بۆ بابەتی مخرجی پیتەکان

| پیت | ناوی پیت | شوێنی دەرچوونی پیت |
|---|---|---|
| ء | همـــزة | ئەوپەڕی گەروو |
| ب | با | نێوانی دوو لێوەکان. |
| ت | تا | پێشەوەی زمان لەگەڵ ڕەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوە. |
| ث | ثا | پشتی پێشەوەی زمان لەگەڵ سەری دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە |
| ج | جیم | ناوەندی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم. |
| ح | حا | ناوەندی گەروو. |
| خ | خا | نزیکترینی گەروو |
| د | دال | پێشەوەی زمان لەگەڵ ڕەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوە |
| ذ | ذال | پشتی پێشەوەی زمان لەگەڵ سەری دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە |
| ر | را | پێشەوەی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە پووکی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە |
| ز | زاي | سەری زمان لەگەڵ خواروی ناوەوەی دوو ددانی پێشەوەی لای خوارەوە. |
| س | سین | سەری زمان لەگەڵ خواروی ناوەوەی دوو ددانی پێشەوەی لای خوارەوە. |
| ش | شین | ناوەندی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم. |
| ص | صاد | سەری زمان لەگەڵ خواروی ناوەوەی دوو ددانی پێشەوەی لای خوارەوە. |
| ض | ضاد | یەکێك لەلا تەنیشتەکانی زمان لەگەڵ لای چەپ یان ڕاستی خرێکانی لای سەروو، هەردوو لاتەنیشتی زمان لە یەك کاتدا لەگەڵ هەردوو لای خرێکانی لای سەروو. |
| ط | طا | پێشەوەی زمان لەگەڵ ڕەگی دوو ددانی سەرەوەی لای پێشەوە. |
| ظ | ظا | پشتی پێشەوەی زمان لەگەڵ سەری دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە. |
| ع | عین | ناوەندی گەروو. |
| غ | غین | نزیکترینی گەروو |
| ف | فا | ناوەوەی لێوی خوارەوە لەگەڵ سەری دوو دانی پێشەوەی لای سەرەوە. |
| ق | قاف | ئەوپەڕی زمان، واتە کۆتایی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە مەلاشوو یان ئاسمانەی سەرووی دەم. |
| ك | کاف | ئەوپەڕی زمان کەمێك دوای مەخرەجی (ق)، لەگەڵ بەرامبەری لە مەلاشوو. |
| ل | لام | یەکێك لە قەراخەکانی پێشەوەی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە پووکی سەرووی دەم لە ئاستی ددانەکانی (ثنايا و رباعيات و أنياب و ضواحك) |
| م | میم | نێوانی دوو لێوەکان. |
| ن | نون | پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ پدوی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوە. |
| هـ | ها | ئەوپەڕی گەروو. |
| و | واو | الواو غير المديه: واوی نێوانی دوو لێوەکان. الواو المديه: بۆشایی ناو دەمو قوڕگ |
| ا | ألف | بۆشایی ناو دەمو قوڕگ |
| ي | یا | الياء غير المدية: ناوەندی زمان لەگەڵ بەرامبەری لە ئاسمانەی سەرووی دەم الياء المدية: بۆشایی ناو دەمو قوڕگ. |

# سیفەتی پیتەکان ( صفات الحروف)

**سیفەتی پیتەکان : ئەو نیشانە و تایبەتمەندیانەیە کە بەهۆیەوە پیتەکانی پێ دەناسرێتەوەو لە یەکدی جیادەکرێنەوە**

**سوودی زانینی سیفەتی پیتەکان :**

**١ـ جیاکردنەوەی پیتە هاوبەشەکان و نزیکەکان لە شوێنی دەرچوون ( مخرج )ەکانیان.**
( ت ، د ، ط ) ، ( ذ ، ث ، ظ ) ، ( ق ، ك ) .

**٢ - زانینی پیتە بەهێزەکان لە پیتە لاوازەکان ، ئایا دەتوانرێت بەیەکەوە تێکهەڵکێش ( دەغم ) بکرێن ، بۆنموونە پیتی ( ط ) کەپیتێکی بەهێزە ، وەپیتی ( ت ) کەپیتێکی لاوازە ، ئەگەر پیتی ( ت ) لەپێش پیتی ( ط ) ەوە هات ، ئەواپیتی ( ت ) دەغم دەبێت لە پیتی ( ط) بەتەواوی ، بۆ نموونە :**

( وَدَّت طَّائفةٌ ) ، **کەئەمەش پێی دەووترێت ( الإدغام الكامل ) کە دواتر زیاتر لەسەر ئەم بابەتە دەدوێین ان شاء الله.**

**بەڵام ئەگەر پیتی ( ط ) لەپێش پیتی ( ت ) ەوە هات ، ئەوا پیتی ( ط ) بەتەواوی تێکهەڵکێش ( دەغم ) ناکرێت ، بۆیە پێی دەووترێت تێکهەڵکێشی ناتەواو ( الإدغام الناقص ) ، واتە پیتی ( ط ) خۆی دەڕوات، بەڵام سیفەتەکەی کە (إستعلاء ، إطباق) ە دەمێنێتەوە ، وەکو** ( بَسَطتَ )

**٣ـ باش دەربڕینی پیتەکان ( تحسين نطق الحروف ) :**

**ئەگەر دوو پیت لەووشەیەك دا كۆبوونەوە ، واتە یەکێکیان گەورە ( تفخيم ) و ئەوی تریان ئاسایی ( ترقيق ) بوو ، ئەوا دەبێت ئاگادار بین کە نەکرێن بەیەك پیت ، بەڵکو دەبێت هەرپیتێك ڕەچاوی ( مەخرەج ) و ( سیفەت )ی بکرێت بۆ نموونە** ( يَختَصُّ ) ، ( مَخمَصةٍ ) ، ( سُلطاناً ) .

**٤ - سیفات زەمەن دەدات بە پیتەکان ، وەکو پیتەکانی** ( رخاوة ) .

**٥ـ فیکە ( صفير ) دروست دەکات لەگەڵ پیتەکانی ( ص ، س ، ز ) .**

**٦ـ دروست بوونی مینگە ( غنە ) لەگەڵ پیتەکانی ( م ، ن ) .**

**٧ـ دەرچوونی هەوا لەگەڵ هەندێك پیت پیتەکانی** ( الهمس ) .

# جۆرەکانی سیفەت لە پیتەکانی زمانی عەرەبیدا

**پیتەکانی زمانی عەرەبی دوو جۆرسیفەتیان هەیە :**

**یەکەم : سیفەتە هەمیشەییەکان**

**ئەو سیفەتانەن کە بە شێکن لە پیتەکەو هەرگیز لێی جیانابنەوە، ژمارەیان لەسەر ڕای زۆرێك لە زانایان حەڤدە سیفەتەو دابەش دەبن بۆ:**

**أ ـ ئەو سیفەتانەی دژ (ضد) یان هەیە، بریتین لە (١٠) سیفەت**

**ب ـ ئەو سیفەتانەی دژ (ضد) یان نییە، بریتین لە (٧) سیفەت.**

**دووەم : سیفەتە کاتییەکان**

**ئەو سیفەتانەن بەهۆی شوێنی پیتەکەوە لە وشەکەدا توشی دەبێت، واتە تەواوکەری پیتەکەن‌و لە هەندێ دۆخی دیاریکراودا تووشی پیت دەبن‌و لە هەندێك دۆخیشدا لەبەر هۆکارێك لێی جیادەبنەوە، لەکاتی جیابونەوەشیاندا کاریگەرییان لەسەر خودی پیتەکە نییە، وەك( الإدغام ، الإخفاء ، الإظهار ، الإقلاب ، المد ، القصر ، التفخيم ، الترقيق ، السكت ، التحريك ، السكون ، ... )**

## أ ـ ئەو سیفەتانەی دژ (ضد) یان هەیە بریتین لە (١٠) سیفەت

١ . الهَمْس ( شاردراوەیی ، دەنگێکی نزم ) × ٢ . الجَهْر ( ئاشکرا )

٣ . الشِدَّة ( توندی ) × ٤ . الرَّخاوة ( شلی )

التوسط ، البينية

(مامناوەند لە نێوان توندی و شلی)

ئەم سیفەتە کەوتوەتە نێوان شدە و رخاوە

٥ . الإستِعلاء ( بەرز بوونەوە ) × ٦ . الإسْتِفال ( نزم بوونەوە )

٧ . الإطْباق ( پێوە نووسان ) × ٨ . الإنفِتاح ( کرانەوە )

٩ . الإذلاق ( زمان تیژی ) × ١٠ . الإصمات ( المنع) ( قەدەغە )

**ب ـ ئەو سیفەتانەی دژ ( ضد) یان نییە، بریتین لە (٧) سیفەت.**

١ . القلقلة ( شپرزە بوون )

٢ . الصفير ( فیکە )

٣ . اللين ( نەرمی و ئاسانی )

٤ . التكرير (دووبارە بوونەوە)

٥ . الإنحراف ( لادان )

٦ . التفشي ( بڵاوبوونەوە )

٧ . الإستطالة ( درێژ کردنەوە )



# باس کردنی سیفەتی پیتەکان

## ئەو سیفەتانەی دژ (ضد) یان هەیە

**١ ـ الهمس( شاردنەوە ): بریتییە لە شاراوەیی لە بیستندا، واتە گوێگر زۆر بەڕوونیو ئاشکرایی نایبیستێت، کەسی نزیك دەیبستێتو کەسی دوور نایبیستێت، هەروەها ئەم پیتانە لەکاتی دەربڕیندا هەناسەیان لەگەڵ دێت، ئەمانەش (١٠) پیتن ، کە لەم ڕستەیەدا کۆدەبنەوە (سَكَتَ فَحَثَّه شَخْصٌ)**

**٢ ـ الجهر (ئاشکرا): بریتییە لەو پیتانەی گوێگر بەڕوونیو بە ئاشکرایی دەیبیستێت، بەهۆی گیرانی زۆر لە هەناسە لە کاتی دەربڕینی پیتەکاندا، ئەمەش لەبەر بەهێزی پشت بەستنە بە شوێنی دەرچوونی پیتەکە، پیتەکانی جهر (١٩)نۆزدە پیتن ، کە لەم ڕستەیەدا کۆدەبنەوە (عَظُمَ وَزنُ قارئ ذي غَضٍّ جَدٍ طَلَبَ)**

**٣ ـ (الشِدَّة) توندی: ئەو پیتانەن کە لەکاتی دەربڕیندا دەنگی لەگەڵ دەپچڕێت (قطع) دەبێت لەبەر داخرانی شوێنی دەرچونیانو هێزی پشت بەستن بە شوێنی دەرچوونی پیتەکە، یان (گیرانی ڕۆیشتنی دەنگ لە ئەنجامی داخرانی شوێنی دەرچوونی پیت) ژمارەی ئەو پیتانەش (٨)هەشت پیتنو کۆدەبنەوە لە ڕستەی (أجِدُ قطٍ بَكَتْ).**

**ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی (الشِدَّة) دەردەخات**



**التوسط (البينية) ناوەند:**

**بریتییە لە ڕۆیشتنی بەشێك لە دەنگ لە شوێنی دەرچوونی پیتەکە بەهۆی تەواو دانەخرانو قەپات نەبوونی شوێنی دەرچوونەکە، ئەوانیش (٥)پێنج پیتنو دەکەونە نێوانی (الشِدَّة و الرَّخاوة) ، وە کۆدەبنەوە لە ڕستەی (لِنْ عُمَر).**

الجريانُ الجزئيُّ للصوتِ عندَ نُطقِ اللامِ
بسببِ اعتراضِ طرَفِ اللسانِ لخروجِه






منظرٌ أماميٌّ للفمِ أثناءَ نطقِ حرفِ اللّامِ

الجريانُ الجزئيُّ للصوتِ عندَ نُطقِ الراءِ
بسببِ اعتراضِ أغلبِ طرَفِ اللسانِ لخروجِه






منظرٌ أماميٌّ لنُطقِ الراءِ يُبيِّن بقاءَ فَجوةٍ عندَ منتهى طرَفِ اللسانِ يَمرُّ منها جزءُ الصوتِ

١٤٢

**لەکاتی دەرچوونی پیتی (م، ن) دەم دادەخرێت، بەڵام بەشێك لە دەنگەکەیان لە ڕێگای (خیشوم) کە غوننەیە دەردەچێت بەهۆی دوو کونی لووتەوە، شوێنی داخران لە پیتی (ن) بەهۆی پێشەوەی زمان پووکە، بەڵام شوێنی داخران لە پیتی (م) بەهۆی دوو لێوەکانە.**







**کەواتە(الغُنَّة) مینگە : ئەو دەنگەیە لەگەڵ پیتەکانی (ن، م)لە لووتەوە دەردەچێت بەبێ بەشداریکردنی زمانو بڕی دوو حەرەکە درێژ دەکرێتەوە .**

٤ - (الرَّخاوة) شلى: بريتييه له ڕۆشتنى تەواوى دەنگى پيتەكە لەكاتى تێپەڕبوونى بەشوێنى دەرچونيدا، يان (ڕۆيشتنى دەنگە لەكاتى تێپەڕبوونى لە شوێنى دەرچوونى) ئەمانەش جگە لە پيتەكانى (الشّدَّة و البينة) ن ، كە (١٦) پيتن ، وە لەم رستەيەدا كۆبوونەوەتەوە (خُذْ غُثَّ حَظِّ فُضَّ شُوصٍ زيٍ سٍاهٍ ) .

ئەم وێنەيەچۆنيەتى دەربڕينى سيفەتى (الرَّخاوة) دەردەخات



٥ ـ **(الإستعلاء) بەرزبوونەوە:** سیفەتی ئەو پیتانەیە کە لەکاتی دەربڕیندا کۆتاییەکانی زمان بەرزدەبێتەوە بۆ مەڵاشوو واتە ئاسمانەی سەرووی دەم، هەروەها دەنگیش بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمانەی سەرووی دەم. پیتەکانی (٧)حەوت پیتن و کۆدەبنەوە لە ڕستەی (خُصَّ ضغطٍ قِظ)




ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی (الإستعلاء) دەردەخات

٦ ـ **(الإستفال) نەوی بوونەوە، نزم بوونەوە:** بریتییە لەوەی لەکاتی دەربڕینی پیتەکانی دەنگ بۆ ئاسمانەی سەرووی دەم ناڕوات و پیتەکانیشی جگە لە پیتەکانی (الإستعلاء) ن کە (٢٢) پیتن وە لەم ڕستەیەدا کۆبوونەوەتەوە (أُنْشُرْ حَديث عِلْمِكَ سَوفَ تُجْهِزُ بِذا)




ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی (الإستفال) دەردەخات

٧ ـ **(الإطباق) پێکەوە نووسان:** بریتییە لە گیربوونی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکانی لە نێوان زمانو ئاسمانەی سەرووی دەم، ژمارەی پیتەکانیش (٤)چوار پیتن کە ئەمانەن (ص، ض، ط، ظ)




ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی (الإطباق) دەردەخات

٨ ـ **(الإنفتاح) کرانەوە:** ئەمەش هەموو پیتەکان دەگرێتەوە بێجگە لە پیتەکانی (الإطباق) کە (٢٥) پیتنو لەکاتی دەربڕینیاندا دەنگ گیر (حصر) نابێت لە نێوانی زمانو ئاسمانەی سەرووی دەم، واتە نە زمان نە دوو لێوەکان ڕێگە لە دەرچوونی دەنگەکە ناگرن.

وە لەم ڕستەیەدا پیتەکانی کۆبوونەوەتەوە(مَنْ أَخَذَ وَجَدَ سَعة فَزَكَا حَقٌّ لَهُ شُرْبُ غَيْثٍ)




ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی(الإنفتاح) دەردەخات

٩ ـ (الإذلاق) زمان پاراوی‌و زمان تیژی: بریتییه له دەرچوونی پیتەکان بە سووکی‌و تیژی وەك (ل، ر، ن) چونکە لە پێشەوەی زمان دەردەچن، هەروەها (ف، ب، م) چونکە لە لێوەکانەوە دەردەچن.

کەواتە پیتەکانی الإذلاق (٦) شەشن کە کۆدەبنەوە لە رستەی: (فرَّ مِنْ لُبّ).

١٠ ـ (الإصمات، المنع) قەدەغە: بۆیە بەم ناوە ناونراوە (قەدەغە) چونکە نابێت ئەگەر چوار یان پێنج پیت لەم پیتانە لە وشەیەك کۆبونەوە پیتێك یان زیاتر لە پیتەکانی (إذلاق)ی تێدا نەبێت. پیتەکانی إصمات (٢٣) پیتن واتە جگە لە پیتەکانی (إذلاق)، وە لەم رستەیەدا کۆبوونەوەتەوە (جُزْ غُشَّ ساخِطٍ صِدْ ثِقَةً إذْ وَعْظُهُ يَحُضُّكَ ) ، وە ئەگەر ووشەیەکیش چوار یان پێنج پیت بوو یەکێك لە پیتەکانی إذلاقی تێدا نەبوو، ئەوە ئەو ووشەیە وشەیەکی بێگانەیەو هاتۆتە ناو زمانی عەرەبی وەکو (عَسْجَد) واتە زێڕ.

تێبینی : سیفەتی( إذلاق ) پەیوەندی بە دەرچوونی پیتەکانیەوە هەیە لە شوێنی دەرچوونیان ، وە (إصمات ) پەیوەندی بە بابەتی علمی (صرف) وە هەیە ، کەواتە ئەم دووسیفەتە پەیوەندی ڕاستەو خۆیان نیە بە زاتی پیتەکانەوە .



## ئەو سیفەتانەی دژ (ضد) یان نیە

١ ـ (القلقلة) دەنگدانەوەیەكی گەورە ، (٥) پێنج پیتی هەیە .

**لە زمانەوانیدا :** چاوگە (مصدر) یانی جووڵەی شپرزەدار (دەنگدانەوە، زرنگانەوە، لەرینەوە).

**لە زاراوەدا :** شپرزە بوونی پیتە لە شوێنی دەرچوونی لەكاتی گوتنی بە زەنەداری تاوەكو دەنگێكی گەورەی بەدوادا دێت. (دەنگێكی بەهێز دەردەچێتو دەلەرێتەوە لەكاتی (زەنەدار) بوون ، واتە : ساكن بوونی پیتەكانی كە پێنج پیتن ( قُطْب جَدٍ).

پیتەكە بۆیە شپرزە دەبێت چونكە دەنگ دەگیرێت بەهۆی گیران‌و قەپات بوونی شوێنی دەرچوونی پیتەكە، ئینجا كە رێگا بوویەوە پیتەكە لەكاتی دەرچوونی دەنگێكی گەورەی بەدوادا دێت.

ژمارەی پیتەكانی قلقلة (٥)و لەم دوو وشەیەدا كۆبونەتەوە (قُطبُ جَدّ)، دەبێت ئەم پیتانە سكونداربن ئینجا حوكمی قەلقلەیان بەسەردا جێبەجێدەبێت، ئەگەر سكوندار نەبوون ئەوە پیتی قەلقەلە نین‌و حوكمی قەلقەلەشیان لەسەر جێبەجێناكرێت.

قلقلە دابەش دەبێت بۆ دوو بەش :

**یەكەم : (القلقلە الصغری) قەلقەلەی بچووك**

ئەو كاتە دروست دەبێت كە پیتە قەلقەلەكە ساكن بێت‌و لە ناوەندی وشەكەدا بێت، یان لە كۆتایی وشەدا بێت بەڵام نەوەستین لەسەری.

نموونە بۆ ناوەڕاستی وشە : ( يَقْضِي ، يُطْعِمون ، يَبْخَلون ، يَدْخُلون )

نموونە بۆ كۆتایی وشە وە لەسەری نەوەستیت:(هَبْ لَنا ، قَدْ أَفْلَحَ ، لِيُنْفِقْ ذوسَعةٍ ، لَقَدْكان )

**دووەم : (القلقلة الكبری) قەلقەلەی گەورە**

ئەوكاتە دروست دەبێت كە پیتی قەلقەلەكە لە كۆتایی وشەكەدا بێت‌و لە حاڵەتی وەستان بەدەنگ ساكن بكرێت. وەك (الأَسواقْ، مُحِيطْ، كِتابْ، البُروجْ، أَحَدْ، حَقّْ، الحَجّْ)

تێبینی : هەندێك قەلقەلەیان دابەش كردوە بۆ سێ بەش **(القلقلة الصغری، القلقلة الوسطی، القلقلة الكبری)**

٢ـ (الصفير)فیكه ، (٣) سێ پیتی هەیه .

**له زمانەوانیدا :** دەنگێكه له دەنگی باڵنده دەچێت، دەنگی تیژ، فیكه.

**له زاراوەدا :** دەنگێكه له نێوان ددانەكانی پێشەوه و سەری زمان وەك فیكەلێدان دەردەچێت. وه سیفەتی صفیر بریتییه له بەرزی له دەنگی پیت ئەوەش لەوه پەیدا دەبێت كه پیتەكه به شوێنێكی تەنگدا دەڕوات، پیتەكانی سێ پیتن (ص، س، ز).




ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی (الصفیر) دەردەخات

٣ ـ ( اللین ) نەرمیو ئاسانی ، (٢) دوو پیتی هەیه .

بریتییه له دەرچوونی پیت له مەخرەجەكەیەوه به ئاسانیو نەرمی.

بریتییه لەوەی كه پیتی ( ـَـ وْ، ـَـ یْ) ساكن بن و پێشیان سەر (الفتحه)ی هەبێت، ئەگەر وابوو ئەوه به ئاسانیو به نەرمی دەردەچن له شوێنی دەرچونیان.

وەك : خَوْف ، يَوْم ، البَيْت ، قُرَيْش

٤ ـ ( الإنحراف ) لادان ، (٢) دوو پيتى هەيە .

سيفەتێكە تايبەتە بە دوو پيتى ( ل ، ر ) كە لە كاتى دەربڕينيان دەنگى پيتەكە لادەدات.

أ ـ لە پيتى (ل) لا دەدا بۆ هەردوو لاتەنيشتى پێشەوەى زمان لەبەرئەوەى پێشەوەى زمان ڕێگەى دەنگەكەى گرتووە

ب ـ وە پيتى (را) بە پێچەوانەوە دەنگ لە هەردوولاتەنيشتى پێشەوەى زمان لادەدات بۆ ناوەندى زمان .







ئەم وێنەيەچۆنيەتى دەربڕينى پيتى (لام) دەردەخات




چۆنيەتى لادانى پيتى ( لام ) لە مخرجەكەى وهاتنەدەرەوەى هەوا لە هەردوو لاتەنيشتى زمانەوە ئەمە بريتيە لە سيفەتى إنحراف

چۆنيەتى لادانى پيتى ( را ) لە مخرجەكەى وهاتنەدەرەوەى هەوا لە ناوەڕاستى زمانەوە ئەمە بريتيە لە سيفەتى إنحراف

٥ـ ( التكرير ) دووباره بوونەوه ، (١) یەك پیتی هەیە .

له زمانەوانیدا : واته دووبارەبونەوەی شتێك زیاتر له جارێك.

له زاراوەدا : بریتییه له لەرزینی پێشەوەی زمان لەكاتی خوێندنی پیتی (را) به لەرزینێكی شاراوه له دەرئەنجامی تەنگی شوێنی دەرچوونی ئەم پیته

پێویسته قورئان خوێن وریا بێت زیادەڕۆیی نەكات له لەرزینی زمانی تا حالّ بەوه نەگات زیاتر له یەك پیتی (را) بەدیار بكەوێتو دەربچێت له دەم.

٦ - (التّفَشّي) بلاّوبونەوه ، (١) یەك پیتی هەیه .

بریتییه له بلاّوبونەوەی دەنگی پیتی (شین) له شوێنی دەرچوونی تا بەر ناوەوەی ددانەكانی سەروو خواروو دەكەوێت.

٧ـ (الإستطالة) درێژكردنەوه ، (١) یەك پیتی هەیه .

بریتییه له پالّدانی زمان له كۆتایی دەمەوه تا پێشەكەی، تا سەری زمان دەنووسێت به ڕەگی دوو ددانی پێشەوەی لای سەرەوه، ئەمەش بەهۆی ئەو هەوا پالّنراوەی لای پشتی زمانه.




ئەم وێنەیەچۆنیەتی دەربڕینی سیفەتی (الإستطالة) دەردەخات

# ئەم خشتەیە بریتیە لە کورتەیەك بۆ بابەتی ژمارەی سیفەتی پیتەکان

| پیت | ناوی پیت | سیفەتەکانی | کۆی سیفەتەکانی |
|---|---|---|---|
| ء | همــــزة | الجهر ، الشدة ، الإصمات ، الإستفال ، الإنفتاح | ٥ |
| ب | با | الجهر ، الشدة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإذلاق ، القلقلة | ٦ |
| ت | تا | الهمس ، الشدة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ث | ثا | الهمس ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ج | جيم | الجهر ، الشدة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات ، القلقلة | ٦ |
| ح | حا | الهمس ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| خ | خا | الهمس ، الرخاوة ، الإستعلاء ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| د | دال | الجهر ، الشدة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ذ | ذال | الجهر ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ر | را | الجهر ، التوسط ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإذلاق ، الإنحراف ، التكرير | ٧ |
| ز | زاي | الجهر ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات ، الصفير | ٦ |
| س | سين | الهمس ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات ، الصفير | ٦ |
| ش | شين | الهمس ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات ، التفشي | ٦ |
| ص | صاد | الهمس ، الرخاوة ، الإستعلاء ، الإطباق ، الإصمات ، الصفير | ٦ |
| ض | ضاد | الجهر ، الرخاوة ، الإستعلاء ، الإطباق ، الإصمات ، الإستطالة | ٦ |
| ط | طا | الجهر ، الشدة ، الإستعلاء ، الإطباق ، الإصمات ، القلقلة | ٦ |
| ظ | ظا | الجهر ، الرخاوة ، الإستعلاء ، الإطباق ، الإصمات | ٥ |
| ع | عين | الجهر ، التوسط ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| غ | غين | الجهر ، الرخاوة ، الإستعلاء ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ف | فا | الهمس ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإذلاق | ٥ |
| ق | قاف | الجهر ، الشدة ،الإستعلاء ، الإنفتاح ، الإصمات ، القلقلة | ٦ |
| ك | كاف | الهمس ، الشدة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ل | لام | الجهر ، التوسط ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإذلاق ، الإنحراف | ٦ |
| م | ميم | الجهر ، التوسط ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإذلاق | ٥ |
| ن | نون | الجهر ، التوسط ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإذلاق | ٥ |
| هـ | ها | الهمس ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| و | واو | الجهر ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات ، اللين | ٦ |
| لا | ألف | الجهر ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات | ٥ |
| ي | يا | الجهر ، الرخاوة ، الإستفال ، الإنفتاح ، الإصمات ، اللين | ٦ |

# هێزی سیفەتی پیتەکان

**بۆ زانیاری زیاتر : لە ڕوانگەی بەهێزیو لاوازییەوە سیفاتی پیتەکان دەکرێت بە سێ بەشەوە**

| الصفات القوية : سيفەتە بەهێزەکان | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| الجهر | الشدة | الإطباق | الإستعلاء | القلقلة | الصفير | الإنحراف | التكرير | التفشي | الإستطالة | الغنة |

| الصفات المتوسطة : سيفەتە مام ناوەندەکان | | |
|---|---|---|
| التوسط | الإصمات | الإذلاق |

| الصفات الضعيفة : سيفەتە لاوازەکان | | | | |
|---|---|---|---|---|
| الهمـــــــــس | الـــرخــــــاوة | الإستفـــــــال | الإنفتـــــــاح | الليــــــــن |

# یاساکانی نونی ساکن و تەنوین
# أحكام النون الساكنة والتنوين

پێناسەی تەنوین : نوونێکی ساکنە کە شێوازی نووسینەکەی بریتی یە لە :

﴿ دووبۆر ( **ضمتان** ) یا دوو سەر( **فتحتان** ) یا دوو ژێر ( **كسرتان** ) ﴾

( ــٌـ دوو ضمة ، ــًـ دوو فتحة ، ــٍـ دوو كسرة )

| شێوازی نوسینی تەنوین | شێوازی خوێندنەوەی لە کاتی گەیاندنی بە وشەی دوای خۆی | شێوازی خوێندنەوەی لە کاتی وەستان لەسەر وشەکە |
|---|---|---|
| كتابٌ | كِتابُنْ | كتابْ |
| كتاباً | كِتابَنْ | كتاباْ |
| كتابٍ | كِتابِـنْ | كتابْ |

هەر کاتێك نوونی ساکن ( نْ ) یا ( تەنوین ) (ــٌـ ، ــًـ ، ــٍـ ) ، پیتەکانی زمانی عەرەبییان بە دوادا هات ، ئەوا چوار حاڵەت دروست دەبێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە :

١ ـ ( الإدغام )حاڵەتی تێکهەڵکێشان

٢ ـ ( الإقلاب )حاڵەتی وەرگەڕان

٣ ـ ( الإخفاء )حاڵەتی شاردنەوە

٤ ـ ( الإظهار )حاڵەتی ئاشکرا کردن

## حاڵەتی یەکەم : الإدغام ، تێکهەڵکێشان

ئەگەر لەدوای نوونی ساکن و تەنوینەوە یەکێك لەم پیتانە ( ي ، ر ، م ، ل ، و ، ن ) هات ، ئەوا حاڵەتی تێکهەڵکێشان ( الإدغام ) دروست دەبێت ، کە ئەم پیتانە لەم وشەیەدا کۆبوونەتەوە ( يرملون ) ـە .

( الإدغام ) دەبێت بە دوو جۆرەوە بەو شێوەیەی کە لەم هێڵکاریەدا ڕوون دەبێتەوە :

یەکەم : ( الإدغام بغنة ) تێکهەڵکێشانی بە مینگە

دووەم : ( الإدغام بلا غُنـَّة ) تێکهەڵکێشانی بێ مینگە




ئێستە دێینە سەر باسکردنی هەریەك لەو دووجۆرە إدغامە

یەکەم : ( الإدغام بغنة ) تێکهەڵکێشانی بە مینگە

هەر کاتێك لە دوای نوونی سکوندار یان تەنوین ، یەکێك لەم چوار پیتە هات ( ی ، ن ، م ، و ) کە لە ووشەی ( ینمو ) کۆدەبنەوە ، ئەو کاتە نوونە ساکنەکە یان تەنوینەکە تێکهەڵکێش دەکرێت لەگەڵ یەکێك لەم چوار پیتە ، وەکو یەك پیتی شەدەداری لێدێت لە جۆری پیتی دووەم لەگەڵ دروست بوونی مینگە ، ئەمیش دەبێت بە دوو بەشەوە :

أ ـ ( الإدغام الكامل بغنة ) تێکهەڵکێشانی تەواو ، بە مینگەوە :

ئەگەر لە دوای نوونی سکوندار یان تەنوین یەکێك لەم دوو پیتە ( م ، ن ) هات ، ئەوا نوونەکە یان تەنوینەکە ( مخرج) و (سیفەت ) هەردووکیان لە دەست دەدات و دەغم دەکرێت لە گەڵ پیتەکەی دوای خۆی و دەبنە یەك پیتی شەدەدار، لە وتنیدا پێویستە ڕەچاوی شەدەکە بکرێت و دووجوولّە مینگە بکرێت بۆ نموونە :

| نموونە (الإدغام الكامل بغنة) | شێوازی خوێندنەوەکەی |
| --- | --- |
| مِنْ نِعمةٍ | مِنِّعمة |
| يومئذٍ نّاعِمة | يومئذِ نّاعِمة |
| مِنْ مَّارِج | مِمَّارِج |
| جزاءً مِن | جزاءَ مِّن |

ب ـ ( الإدغام الناقص بغنة ) تێکهەڵکێشی ناتەواو ، بە مینگەوە:

ئەگەرلە دوای نوونی سکوندار یان تەنوین یەکێك لەم دوو پیتە ( و ، ی ) هات ، ئەوا نوونەکە یان تەنوینەکە تەنها ( مخرج) لە دەست دەدات وە سیفەتەکەی دەمێنێت و لەدەستی نادات ، دواتردەغم دەکرێت لە گەڵ پیتەکەی دوای خۆی ، وە لە وتندا دەبنە یەك پیت وە پێویستە ڕەچاوی شەدەکە بکرێت و دووجووڵە مینگە بکرێت ، بەڵام شەدەکە دانەنراوە لە سەریان بە مەبەستی ئەوەی کە ئاماژەبێت بەوەی کە ئەم جۆرە لە إدغام بریتیە لە إدغامی ناقص ، بۆ نموونە :

| نموونە ( الإدغام الناقص بغنة ) | شێوازی خوێندنەوەکەی |
|---|---|
| مِن وَلِي | مِوَّلي |
| غِشاوةٌ وَلهُم | غِشاوةُ وَّلهم |
| مَن يَقُوْلُ | مَيَّقول |
| خَيْراً يَرهُ | خَيرَيَّره |

دووەم : ( الإدغام بلا غُنـَّة ) تێکهەڵکێشانی بێ مینگە

ئەگەر لە دوای نوونی سکوندار یان تەنوین یەکێك لەم دوو پیتە ( ل ، ر ) هات ، ئەوا نوونەکە یان تەنوینەکە ( مخرج) و (سیفەت ) هەردووکیان لە دەست دەدات و دەغم دەکرێت لە گەڵ پیتەکەی دوای خۆی و دەبنە یەك پیتی شەدەدار، لە وتنیدا پێویستە ڕەچاوی شەدەکە بکرێت ، وە نابێت مینگە بکرێت ئەم جۆرە لەتێکهەڵکێشان( ئیدغام )ە پێی دەووترێت ( إدغامی کاملی بلا غنة ) ،چونکە نوونەکە ( مەخرەج و سیفەت ) ی لەدەست دەدات و مینگەش نامێنێت ، وەکو ئەم نموونانەی لای خوارەوە :

بۆ نموونە :

| نموونە ( الإدغام بلا غُنـَّة ) | شێوازی خوێندنەوەکەی |
|---|---|
| مِنْ لَّدنه | مِلَّدُنه |
| هُدىً لِّلمتَّقين | هُدَ لِّلمُتَّين |
| مِنْ رَّبهم | مِرَّبِّهم |
| غفورٌ رَّحيم | غَفُوْرُ رَّحيم |

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ لە حاڵەتی ( إدغام ) دا

**تێکهەڵکێشان (إدغام) دەبێت لە دوو وشەدا بێت، نابێت لە یەك وشەدابن ، ئەمەش لە چوار وشە لە قورئاندا هاتوە ، کەواتە ئەگەر نوونی سکوندار لەناوەڕاستی ووشەیەکدا بوو، بەدوایدا پیتێکی إدغام هات ، ئەوا نوونەکە(إظهار ) ئاشکرادەکرێت وە پێیان دەوترێت (الإظهار المطلق) چونکە نە حەلقین وە نەشەفەوین وە نە قەمەرین وە نە إدغامی دوو وشەیین، لەقورئاندا ئەم ووشانە هاتوون نوونەکەیان ئاشکرادەکرێت ( الدنْيا ، صنْوان ، قنْوان ، بنْيان ) ، وەهەروەها لەم شوێنانەش ( إظهار )دەکرێت :**

أ ـ ( يس ، والقران ) .

ب ـ ( ن ، والقلم ).

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر : هۆکارەکانی تێکهەڵکێش کردن ( دمغم ) کردنی نوونی سکوندارو تەنوین لە شەش پیتی ( يرملون ) ـە دا :**

**١ / دمغم کردنی ( نوونی سکوندار ، تەنوین )**

**أ ـ ( للتقارب ) وەك ( ل ، ر ، و ، ي )**

**ب ـ (للتماثل ) وەك (ن)**

**ج ـ (للتجانس ) وەك (م )**

## حاڵەتی دووەم : الإقلاب ، وەرگەڕان :

هەر کاتێك لە دوای نوونی سکوندار یان تەنوین ، پیتی ( ب ) هات ، ئەوا نوونە سکوندارەکە دەکرێت بە ( میم )ێکی خەفیف ، واتە شەدەی نیە ، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ( مینگە ) ، بە ئەندازەی دووجووڵە ، لەیەك ووشە دابن یان لە دوو ووشەدا بن .

تێبینی :

١ ـ لەگەڵ تەنوین تەنیا لە دوو وشەییدا إقلاب ڕوو دەدات، بەڵام لەگەڵ نون لە یەك وشەیی و دوو وشەییشدا ڕوو دەدات.

٢ ـ هەروەها لە کاتی إقلاب دوو لێوەکان بە نەرمی پێکەوە دەنوسێن.

بۆ نموونە :

| نموونە | شێوازی خوێندنەوەکەی |
|---|---|
| أنْ بُورِكَ | أمْبُورِكَ |
| مِنْ بَعد | مِمْبَعدِ |
| سميعٌ بَصير | سميعُمْبَصير |
| لَيُنْـبَذَنَّ | ليُمْبَذَنَّ |

پرسیار بۆ زانیاری زیاتر : بۆچی لەکاتی بەیەکگەیشتنی نوونی زەنندار یان تەنوین بە پیتی ( ب ) نوونەکە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ( م ) ؟

وەڵام :

١ ـ ناتوانرێت ( نوونە سکوندارەکە ) یان ( تەنوینەکە ) ئاشکرا ( إظهار ) بکرێت ، لەبەر قورسی لەکاتی دەربڕین دا و دووری پیتی ( ن ) و ( ب ) لە ( مخرج ) دا .

٢ ـ ناتوانرێت ( نوونە سکوندارەکە ) یان ( تەنوینەکە ) تێکهەڵکێش ( إدغام )بکرێت ، لەبەر جیاوازی جۆری ( مەخرەج ) و ( صفه ) تیان .

کەواتە ئاسانترە نونەکە بکرێت بە پیتی ( میم ) ، چونکە پیتی ( م ، ب ) یەك مەخرەجیان هەیە و هاوبەشن لە ( صفه ) تدا .

## حاڵەتی سێیەم : الإظهار ، ئاشكراكردن

بریتی یە لە ئاشكراكردنی دەنگی نوونی سكوندار یان تەنوین ، واتە لە خوێندنەوەدا هەم مەخرەج وە هەم سیفەت هەردووكیان دەمێنن ، ئەویش كاتێك دروست دەبێت كە ( نوونی ساكن و تەنوین ) دەگات بە ( ٦ ) پیت لە پیتەكانی زمانی عەرەبی كە ئەمانەن : ( ء ، هـ ، ع ، ح ، غ ، خ ) وە پێیان دەوترێت پیتەكانی حلق چونكە مەخرەجی هەموویان(الحلق) گەروە واتە لە قوڕگەوە دەردەچن. جا لە یەك وشەدا بن یان دوو وشە ئەوا إظهار ڕوودەدات .

نموونە:

| پیت | ( نْ ) لەیەك وشەدا | ( نْ ) لە دووشەدا | ( تەنوین) ( ـٌـ ، ـً ، ـٍـ ) |
|---|---|---|---|
| ء | و ينـئَـونَ | ومَنْ أعرضَ عن ذِكري | وجنَّاتٍ ألفافاً |
| هـ | ومنْهُم دونَ ذلك | إنْ هُوَ | ولِكلِّ قومٍ هاد |
| ع | يَنْعِقُ | مِنْ عَلَق | وهوَ بِكلِّ شَيءٍ عَليمٌ |
| ح | وكانوا يَنْحِتونَ مِنَ الجِبال بيوتاً آمنِيْن | مِنْ حَسنةٍ | إنَّ اللهَ عزيزٌ حكيم |
| غ | يُنْغِضُونَ | مِنْ غَيركم | إنَّ اللهَ كانَ عفواً غَفوراً |
| خ | و المُنْخَنِقَةُ | مِنْ خَشيةِ الله | فَمَنْ يَعمَل مِثقالَ ذرَّةٍ خيراً يره |

## چۆنیەتی دەربڕینی ( نوونی ساكن و تەنوین )

هەركاتێك (نوونی زەننەدار یان تەنووین ) گەیشتن بە پیتەكانی گەروو ( الحلق ) ، ئەوا نوونەكە ئاشكرادەكرێت و هیچ گۆڕانكاری یەك ڕوونادات و نابێت لەیەك دابڕێن و نابێت سەكتەشی لەگەڵدا بێت ، وەهەروەها دەبێت زەمەنێكی مام ناوەند ( واتە سیفەتی التوسط) ی لە گەڵ یەك جووڵەمینگە بدرێتیّ بە پێی جۆرەكان تلاوە (تحقیق، حدر ، تدوير).

## حاڵەتی چوارەم : الإخفاء ، شاردنەوە :

هەر كاتێك ( نوونی ساكن ) یان ( تەنوین ) گەیشتن بە ( ١٥ ) پیتی زمانی عەرەبی كەئەمانەن ( ص ، ذ ، ث ، ك ، ج ، ش ، ق ، س ، د ، ط ، ز ، ف ، ت ، ض ، ظ )

ئەوا حاڵەتی شاردنەوە ( الإخفاء) ڕوو دەدات .

ئەم پیتانە لەم دێڕە شیعرەدا كۆدەبنەوە :

( صِف ذا ثَنا كَم جاد شخصٍ قد سَما دُم طيباً زِد في تُقى ضَع ظالِماً ) .

ئەم بە یەك گەیشتنە لە یەك وشەدا بوو یا لە دوو وشەدا بوو ئەوا إخفاء ڕوو دەداتو پێویستە نونە ساكینەكە یا تەنوینەكە مینگەی تێدا بكرێت بە دوو جووڵە و بە شێوەیەكی لێ بكرێت بكەوێتە نێوانی (إظهار و إدغام) ،واتە نە وەكو إظهار ئاشكرا بكرێن نەوەكو إدغام دەغم بكرێن ، وە هەوەها پیتەكەی دوای خۆی بەبێ شەددەیە .



نموونە بۆ حاڵەتی ( الإخفاء) وە هەروها چۆنیەتی دروست وتنی حاڵەتەکە :

| پیت | ( الإخفاء) لەیەك وشەدا | ( الإخفاء) لە دووشەدا | الإخفاء لە تەنوین دا (ـٌ ، ـً ، ـٍ ) | چۆنیەتی وتنی حاڵەتی ( الإخفاء) |
|---|---|---|---|---|
| ١ . ف | يَنْـفقون | و إنْ فاتَكُم | تَؤُزُّهُم أزّاً * فلَاَ | أ ـ لێوی خوارەوە دەدەیت لە ژێری دوو ددانی سەروە<br>ب ـ دووجووڵە مینگەی باریك<br>ج ـ وتنی پیتی (فا) |
| ٢ . ث<br>٣ . ذ<br>٤ . ظ | منْثوراً<br>أنْذرهم<br>يُنْظَرون | منْ ثمرةٍ<br>منْ ذا الذي<br>منْ ظلم | نطفةٍ ثمَّ<br>و طعاماً ذا غصةٍ<br>ظِلاًّ ظَليلاً | أ ـ سەری زمان دێتە نێوان سەنایای عليا و سفلی پێشەوە<br>ب ـ دووجووڵە مینگەی باریك لەگەڵ ( ث ، ذ ) وە دوو جووڵە مینگەی قەڵەو لە گەڵ (ظ)<br>ج ـ وتنی پیتی (ث ، ذ ، ظ) |
| ٥ . ص<br>٦ . ض<br>٧ . ط<br>٨ . ق | منْصوراً<br>منْضود<br>ينْطقون<br>ينْقلبون | منْ صيامٍ<br>منْ ضَعفٍ<br>منْ طينٍ<br>منْ قَبل | بريحٍ صرصرٍ<br>مُسفِرَةٌ *<br>ضَاحِكَةٌ<br>صَعِيداً طَيِّبًا<br>عفوًّاً قديراً | أ ـ زمان دەبەیت بۆ مەخرەجی پیتەکە ، بەرەچاو کردنی دووسیفەتی إستعلاء و إطباق<br>ب ـ دوو جووڵە مینگەی قەڵەو دەڵێیت<br>ج.وتنی پیتی(ص ،ض،ط، ق) |
| ٩ . س<br>١٠ . ش<br>١١. ز<br>١٢. ج<br>١٣. د<br>١٤. ك<br>١٥. ت | الإنْسان<br>منْشوراً<br>أنْزلناه<br>أنْجينا<br>أنْداداً<br>أنْكالاً<br>كنْتم | منْ سلالةٍ<br>لمنْ شاء<br>فإنْ زللتم<br>إنْ جاءكم<br>منْ دابةٍ<br>أنْ كان<br>منْ تحتها | قيلاً سلاماً<br>جباراً شقياً<br>يومئذٍ زُرقاً<br>شَيْئاً * جَنَّاتِ<br>قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ<br>أَجْرٌ كَرِيمُ<br>جَنَّاتٍ تَجْرِي | أ ـ زمان دەبەیت بۆ مەخرەجی پیتەکە ، بەرەچاو کردنی دووسیفەتی إستفال و إنفتاح<br>ب ـ دوو جووڵە مینگەی باریك دەڵێیت<br>ج ـ وتنی پیتی (س،ش،ز،ج،د،ك،ت) |

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**لەکاتی بەیەکگەیشتنی ( نوونی سکوندار یان تەنوین ) بەپیتەکانی ( الإخفاء ) ئەوا ( نوونەکە ) خۆی دەڕوات بە شێوەیەك کە بەشێکی کەمی دەنگی نونەکە هەستی پێ دەکرێت ، بەلاَم ( سیفەت) ـەکەی کە ( مینگە ) یە دەمێنێتەوە، بەشێوەیەك پێشەوەی زمان دووربێ لەڕەگی دوو ددانی سەرەوە ( تجافی بین طرف اللسان ومع مایحاذیه من لثة الأسنان العلیا ، بأن یجعل القاريء لسانه بعیداً عن مخرج النون قلیلاً ) .**

ورتل القرآن ترتيلا

# یاساکانی ( میم )ی ساکن
# أحكام الميم الساكنة

کاتێك میمی ساکین پیتەکانی زمانی عەرەبی بەدوادا دێت، سێ حاڵەتی بۆ دروست دەبێت:

١ ـ (الإدغام الشفوي)تێکهەڵکێشانی لێوی

٢ ـ (الإخفاء الشفوي)شاردنەوەی لێوی

٣ ـ (الإظهار الشفوي )ئاشکراکردنی لێوی

بۆیە پێیان دەوترێت الشفوی چونکە پیتی (م) لە نێوانی دوو لێوەکان دەردەچێت (الشفه) واته لێو (الشفتان واته دوو لێوەکان) (شفوی) واته لێوی، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە (إدغام، إخفاء، إظهار)ی (إحكام الميم الساكنه) جیادەکەنەوە لە (إدغام، إخفاء، إظهار)ی (أحكام النون الساكنة والتنوين).

## یەکەم : ( الإدغام الشفوي ) تێکهەڵکێشی لێوی:

هەر کاتێك (میم)ی سکوندار گەیشت بە (میم)ێکی جوڵاو ( المتحركة ) ، ئەوا ( إدغام الشفوي ) ڕوودەدات ، پێویستە (إدغام ) بکرێت لەگەڵ ڕەچاوکردنی مینگە ( غوننە) ، وە هەروەها ئەم ئیدغامە پێشی دەوترێت تێکهەڵکێشی لەیەك چوو ( الإدغام المتماثلين ) کە لێوەکان بەتووندی بەیەکەوە دەنووسێنرێن ، دیارە ئەم جۆرە لە إدغام لەیەك ووشە یا خود لەدوو وشەدا ڕوودەدات .

نموونە :

| شێوازی نوسینی وشەکە | | شێوازی خوێندنەوەی |
|---|---|---|
| جَآءَكُمْ مُّوسى | ( لە دوو وشەدا ) | جاءکمُّوسی |
| وَمَا بِكُمْ مِّن | ( لە دوو وشەدا ) | وما بکمِّن |
| ماهُمْ مِّنكُمْ | ( لە دوو وشەدا ) | ما هُمِّنكُم |
| الـم | ( لە یەك وشەدا ) | أليف لاَمْ ميم = أليف لامِّيم |
| المص | ( لە یەك وشەدا ) | أليف لاَمْ ميم = أليف لامِّيم صاد |
| المر | ( لە یەك وشەدا ) | أليف لاَمْ ميم = أليف لامِّيم را |

## دووەم : ( الإخفاء الشفوي ) شاردنەوەی لێوی:

بریتی یە لەبەیەکگەیشتنی ( میم )ی ساکن بەپیتی ( ب ) ، ئەو کاتە ( میمە سکوندار)ەکە دەکرێت بە ( میم )ێکی سووک ( خفیف ) لەگەڵ مینگە ( غوننە ) ، لەم کاتەدا دوو لێوەکان بە نەرمی بەیەکترەوە دەنووسێن، وە لە دوو وشەدا ڕوودەدات .بۆ نموونە :

| |
|---|
| (وماهُمْ بِمؤمنين ) ( ترميهِمْ بِحجارةٍ ) ( ومَن يَعتصِمْ بِاللهِ ) ( فاحكمْ بَينهم ) |

## سێ یەم : ئاشکراکردنی لێوی ( الإظهار الشفوي ) :

بریتی یە لە بەیەکگەیشتنی (میمی ساکن ) بەهەموو پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتەکانی ( م ، ب ) ، ئەو کاتە پێویستە ( میم )ەکە ئاشکرا بکرێت ، وە پلەی مینگەکەی ناتەواوە ( الغنة الناقصة ) و سیفەتی ( البينية )ی هەیە . دیارە ئەم جۆرە لە إدغام لەیەك ووشە یا خود لەدوو وشەدا ڕوودەدات .

نموونە :

| | |
|---|---|
| نموونەی الإظهار الشفوي لە یەك وشەدا | الحمْدُ ، أنعمْتَ ، أمْثالكم |
| نموونەی الإظهار الشفوي لەدوو وشەدا | لكمْ آية ، بهمْ خصاصة ، و همْ فيها |

تێبینی بۆ زانیاری زیاتر : جۆرەکانی سکون لە پیتی ( میم ) دا

١ . السكون الأصلي : نموونە، الحمْدُ لله ، قُمْ ( فعل الأمر) ، أمْ ( حرف عطف)

٢ . السكون العارض للجزم : نموونە، و من يعتصمْ بالله

٣ . السكون للتخفيف : نموونە ، عليهمْ ( ميم الجمع في جمع المذكر السالم)

## یاساکانی نونو میمی شەددەدار
## (أحكام الميم و النون المشددتين)

ئەگەر هەریەك لە (میمو نون) شەددەدار بوون پێویستە دوو مەرجیان بەسەردا جێبەجێبکرێن ، لەیەك وشەدابوو یان لە دوو وشەدا.

یەکەم : شەددەکردن          دووەم : مینگە

نموونە : 

| |
|---|
| وأمَّا ، ثمَّ ، كمْ مَّن ، فِئةٍ ، إنَّ ، الجنَّة ، إنْ نَّشأ ، منْ نَّفسِ |

# پلەكانى هێزى مینگە

| ژمارە | جۆرى پلە | حاڵەتەكان | نموونە |
| --- | --- | --- | --- |
| یەكەم | ( أكمل )<br>تەواوترین | ١ . المیم المشددة ( نَّ )<br>٢ . النون المشددة (مَّ)<br>٣.الإدغام<br>( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + م<br>( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + ن<br>( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + ي<br>( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + و<br>٤ . الإدغام الشفوي ( مْ ) + م | إنَّ<br>ممَّا<br>من مَّسد<br>من نِّعمة<br>مَن يَعمل<br>مِن وليّ<br>جاءكم مُّوسى |
| دووەم | (كاملة )<br>تەواو | ١ . الإخفاء<br>( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + ١٥ حرف<br>الإخفاء<br>٢ . الإخفاء الشفوي ( مْ ) + ب<br>٣ . الإقلاب ( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + ب | أنْفسكم<br>ترميمْ بحجارة<br>يُنْبتُ لكم |
| سێیەم | (الناقصة)<br>ناتەواو | ١ . الإظهار الحلقي<br>( نْ ، ــٌ . ــً . ــٍ ) + ٦ أحرف الحلق<br>٢ . الإظهار الشفوي( مْ ) + ٢٦حرف | سميعٌ عليم<br>همْ فيها |
| چوارەم | (الأنقص)<br>ناتەواوترین | ١ . المیم المتحركة ( مَ ، مُ ، مِ)<br>٢ . النون المتحركة ( نَ ، نُ ، نِ) | نَار<br>مِن |

# ياساكانى اللام
# أحكام اللام

ئەو بابەتانەی كە لەم باسەدا دەبێت بیانزانین بریتین لە :

١ . اللام القمري و اللام الشمسي لامی قەمەری و لامی شەمسی(لامی ناساندن)

٢ . لام لفظ الجلالة (الله)لامی ناوی پیرۆزی الله

٣ . لام الأمر ، لامی فەرمان پێكردن

٤ . اللام الساكن في الإسم لامی سكونداری ناو اسم

٥ . اللام الساكن في الفعل لامی سكونداری ناو فعل

٤ . اللام الساكن في الحرف لامی سكونداری حەرف (هَلْ) (بَلْ)

## باس كردنی بابەتەكان

پێش ئەوەی بچینە سەر باسی لامی قەمەری و لامی شەمسی باشتر وایە بزانین مەبەست لە لامی ناساندن چیە :(ألْ) ی ناسێنەر( لامی تعریف) دەچێتە سەر ناو (اسم) ناچێتە سەر (فعل و حرف)، هەمیشە ساكنە ، كاتێكیش دەچێتە سەر هەر ناوێك دەیكات بە ناسراو، بۆ نموونە دەڵێین (مدرسە) واتە قوتابخانەیەك بەڵام نازانین مەبەستمان كام قوتابخانەیەیە، بەڵام كاتێك دەڵێین (المدرسة) واتە قوتابخانەكە دەزانین مەبەستمان كام قوتابخانەیەیە، بەمەش ناوەكە دەبێتە ناوێكی ناسراو، واتە وەك پاشگری ( ـەكە)ی كوردی وایە كە دەچێتە سەر ناو و دەیكات بە ناوێكی ناسراو (منداڵ + ـە كە = منداڵەكە،...)

١ . اللام القمري و اللام الشمسي لامی قەمەری و لامی شەمسی(لامی ناساندن)

أ ـ لامی قەمەری (اللام القمرية)

(ألْ) لامی ناساندن ئاشكرا دەكرێت ( الإظهار) (واتە دەردەخرێت و ناشاردرێتەوە)

ئەگەر هاتوو لە پێش ئەم چواردە پیتەوە هات :

(أ، ب، غ، ح، ج، ك، و، خ، ف، ع، ق، ي، م، ه )

وە پیتەكانی لامی قەمەری لەم ڕستەیەدا كۆدەبنەوە:

(إبغِ حَجَّكَ وَخَفْ عَقيمه)

**نموونە :** الْإِبِلِ ، الْبَقَر ، الْغَنَم ، الْحَآقَّةُ ، الْجِبَالُ ، الْكَافِرون ، الْوَاقِعَة ، الْخَآئِنِين ، الْفَائِزون ، الْعَقِبَةَ ، الْيَاقُوتُ ، الْمَوْتَ ، الْهُون ، الْقَرْيَة

## ب. لامی شەمسی (اللام الشمسية)

(ألْ) لامی ناساندن دەشاردرێتەوەو ناخوێندرێتەوە (الإدغام)، ئەگەر لە پێش ئەم چواردە پیتەوە هات (ت، ث، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ل، ن). واتە ڕاستەوخۆو بەخێرایی دەچینە سەر پیتەکەی دوای لام (وشەکەی دوای خۆی) واتە إدغامی کاملی تێدا ڕوو دەدات و بە تەواوی تێکهەڵکێش دەکرێت لەگەڵ وشەکەی دوای خۆی بەبێ مینگە، بێجگە لە پیتی (نون) کە مینگەی لەگەڵدا دەبێت .

وە لەم دێڕە شیعرەدا کۆبوونەتەوە:

طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحِماً تَفُزْ ضِفْ ذا نِعَم          دَعْ سُوءَ ظَنٍّ زُرْ شَرِيفاً للكرم

نموونە بۆ شێوازی خوێندنەوەی لامی شەمسی :

| شێوازی نوسینی وشەکە | شێوازی خوێندنەوەی |
|---|---|
| الطَّآمَّةُ | أطَّآمَّة |
| الثَّمَرَاتِ | أثـَّمَرَات |
| الصَّلِحتِ | أصَّالِحات |
| الرَّحْمن | أرَّحْمن |
| التَّائِبُونَ | أتَّائبون |
| الضَّآلِّينَ | أضَّالِّين |
| وَالذَّارِيتِ | وَذَّارِيات |
| النَّاس | أنَّاس |
| الدَّاعِيَ | أدَّاعى |
| السَّائِحُونَ | أسَّائِحون |
| الظَّآنِّينَ | أظَّآنِّين |
| الزَّقُّوم | أزَّقُّوم |
| الشَّمس | أشَّمس |
| الَّيْلَ | ألَّيل |

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**١ـ  بۆ ناسینی لامی شەمسیو قەمەری لە قورئاندا، ئەگەر لامەکە سکونی نەبوو، هەروەها پیتی دوای لامەکە شەددەی هەبوو ئەوە لامەکە شەمسییە، بەڵام ئەگەر لامەکە سکونی هەبوو پیتەکەی دواشی شەددەی نەبوو ئەوە لامی قەمەرییە.**

**٢ـ حوکمی لامی قەمەری ( إظهار ) ە وە حومی لامی شەمسی ( إدغام ) ە .**

**٣ـ بۆیە بە لامی شەمسیو قەمەری ناسراون، چونکە وشەی (القمر) لامەکەی ئاشکرا دەکرێت، بەمەش هەر پیتێك لامەکەی ئاشکرا بکرێت پێی دەوترێت لامی قەمەری، بەڵام (الشمس) لامەکەی ئاشکرا ناکرێتو دەغم دەکرێت لەگەڵ پیتەکەی دوای خۆی، بۆیە هەر پیتێك لامەکەی ئاشکرا نەکرێت پێی دەوترێت لامی شەمسی.**



## ٢ . لام لفظ الجلالة (الله) لامی ناوی پیرۆزی الله

لامی وشەی (الله) بە دوو جۆر دەخوێندرێتەوە :

أ ـ التفخيم ( بە قەڵەوی)                                   ب ـ الترقيق(بە باریکی)

**أ ـ لامی وشەی (الله) قەڵەو دەکرێت ئەگەر:**

١ ـ هیچ وشەیەك لە پێشیەوە نەهات: (الله لا إله إلا هو الحي القيوم)

٢ ـ پیتەکەی پێشی سەر (الفتحة)ی هەبێت ، یا بۆر (الضمة)ی هەبێت :

نموونە بۆ پیتی مفتوح لە پێشیەوە : (قَالَ اللهُ)

نموونە بۆ پیتی مضموم لە پێشیەوە : (عَبدُ اللهِ)

٣ ـ ئەگەر پیتەکەی پێشی سکونی هەبێت وە پێش سکونەکەش بۆر (الضمة) هەبێت، یا سەرە (الفتحە) هەبێت :

نموونە بۆ پیتێکی ساکن کە پێشەکەی ضمە بێت : (قالُـوا اللَّهم)

نموونە بۆ پیتێکی ساکن کە پێشەکەی فەتحە بێت : (إلَـــى الله)

**أ ـ لامی وشەی (الله) باریك دەکرێت (وەك لامێکی ئاسایی دەخوێنرێتەوە) ئەگەر:**

١ ـ پێش ناوی خوا ژێر (الکسرة) هەبێت :

نموونە بۆ پیتێکی مکسور لە پێشیەوە : (بِسمِ اللهِ الرحمن الرحيم)

نموونە بۆ ئەوەی کە حەرفی جەر چووبێتە سەر (الله) : ( لِلَّه مَا في السَّموَتِ...)

٢ ـ پیتەکەی پێشی زەننەی هەبێت پێش زەننەکەش ژێر هەبێت : (وَ يُنَجِّـي اللهُ)

٣ ـ پیتەکەی پێشی تەنوینی هەبێت : (قَوماً الله) (قُلْ هُوَ اللهُ أَحدٌ * اللهُ الصَّمَدُ)

لە زمانی عەرەبیدا دوو سکون بەدوای یەکدا نایەن بۆیە سکونی یەکەم دەبێت بە کسرەو ئەو کاتە بە ناسکی دەخوێنرێتەوەو پێی دەوترێت (التقاءُ الساكنين)

(قَوماً اللهِ = قَومَنْ الله = قَومَنِ الله)( قُلْ هُوَ اللهُ أَحدُنِ اللهُ الصَّمَدُ)

لە وەصلدا ئەم حاڵەتەدا ڕوودەدات .

### ٣ . لام الأمر ، لامی فەرمان پێکردن

بریتییە لە لامێکی سکوندار دەچێتە سەر (فعل مضارع) کە بەشێك نییە لە پێکهاتەی فیعلەکە، (فعل مضارع)ـەکە دەگۆڕێت بۆ مانای فەرمان کردن واتە (أمر)، پێویستە ئەم لامە ئاشکرا بکرێت ( الإظهار)و مەرجیشە لە پێش ئەم لامەوە (ثُمَّ) (واو) (فاء) هەبێت ، ئەو کاتە ساکنە ، وەك ئەم نموونانەی لای خوارەوە :

ثُمَّ لْــيَقضُواْ تَفَثَهُمْ (الحج: ٢٩)
وَلْــيُوفُواْ نُذُورَهُمْ (الحج: ٢٩)
فَــلْيَمدُدْ بِسَبَبٍ إِلى السَّمَآءِ (الحج:١٥)

بەلاّم ئەگەر هیچ یەك لەو سیانە لە پێشیەوە نەبوون وە بە فیعلەکە دەست بە خوێندنەوە بکەین ئەوا دەگەڕێتەوە سە حالّەتە ئەصلیەکەی خۆی کە لامی أمر کسره ی لە ژێردایە ، وە لامەکە کەسرەدار دەکرێت، لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبیدا نابێت پیتی سەرەتا کە دەست بەخوێندنەوەی دەکەین سکوندار بێت بۆیە دەکرێت بە ژێر (الکسره) وەك :

(ثُمَّ لْــيَقْضُوا) بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە (..... لِــــيَقْضُوا )

### ٤ . اللام الساكن في الإسم لامی سکونداری ناو اسم

مەبەست پێی ئەو لامە سکوندارەیە کە بەشێکە لە بنچینەی دامەزراوەی ناوەکە (واتە لە بنەڕەتدا هی خۆیەتیو بۆی زیاد نەکراوە) ئەم لامەش بەردەوام دەکەوێتە ناوەندەکانی ناوەوە، ئەگەر وابوو پێویستە ئاشکرا بکرێت ( الإظهار).

نموونە : ( أَلْــسِنَتُكُمُ ، وَأَلْــوَنِكُمْ ، سَلْسَبِيلاً، سُلْطَنًا )

## ٥ . اللام الساكن في الفعل لامی سکونداری ناو فعل

ئەو لامەیە کە سکوندارەو دەکەوێتە ناو فیعل، دەبێت ئاشکرا بکرێن، ئینجا فعلەکە ڕابردوو یان ڕانەبردوو یان ئەمر بوو.

نموونە : ( إلْتَقى ، إلْتَقَمَه ، أَدْخِلْني ، أَنزَلْنَاه ، جَعَلْنَا ، قُلْنَا ، قُلْ ، وَقُلْنَ )

بەڵام ئەگەر لامە سکوندارەکە کەوتبوە کۆتایی وشەکە وە بە دوایدا پیتی (لام) یا پیتی (ڕا)بەدوایدا هات ئەو کاتە پێویستە دەغم (الإدغام) بکرێت، لەم کاتەدا (إدغام المتقاربين) ڕوو دەدات .

نموونە :

| شێوازی نوسینی وشەکە | شێوازی خوێندنەوەی |
|---|---|
| قُلْ لَّآ أَقُولُ لَكُمْ | قُلاَّ أقول |
| وَقُلْ رَّبِّ | وَقُرَّبّ |

## ٤ . اللام الساكن في الحرف لامی سکونداری حەرف (هَلْ) (بَلْ)

(هَلْ) بۆ پرسیار بەکاردێت، (بَلْ) بۆ وەڵامی هەڵوێستێك بەکاردێت.

لامی سکونداری (هَلْ) و (بَلْ) پێویستە ئاشکرا بکرێن( الإظهار) .

نموونە : (بـَلْ نَحْنُ ، بَلْ زَعَمْتُمْ ، بـَلْ طَبَعَ ، بـَلْ سَوَّلَتْ ، هَلْ تَرى ، هَلْ ثُوِّبَ )

بەڵام ئەگەر (هَلْ) و (بَلْ) پیتی (لام) یا (ڕا) بەدوایاندا هات ئەو کاتە دەغم (الإدغام) دەکرێن لەگەڵیاندا.

| شێوازی نوسینی وشەکە | شێوازی خوێندنەوەی |
|---|---|
| بَلْ رَّفَعَهُ | بَــرَّفَعَه |
| بَلْ لاَّ يَخافُون | بـلاَّ يَخافُون |
| هَلْ لَّكُمْ | هَلَّكم |

# یاساکانی پیتی (را)

# أحكام الراء

پیتی (را) یەکێکە لەو پیتانەی کە پێویستە لەکاتی خوێندنەوەیدا ڕەچاوی دەنگەکەی بکرێت کە بە دووجۆر دەردەکەوێت کە بریتین لە :

١ـ گەورە کردن (التفخيم).




٢ ـ باریك کردن ( بچووك کردن (الترقيق).




وە هەروەها لە چەند وشەیەکدا بە هەردوو جۆرەکە دەخوێندرێتەوە ( جواز الوجهين ).

## یەکەم : گەورە کردن (التفخيم).

پیتی (را) بە گەورە دەخوێنرێتەوە کاتێك:

١ ـ پیتی (را) ( ضمة) یا (فتحە) ی هەبێت .

نموونە : (عشـرُ ون ، رَيب )

٢ ـ پیتی (را) ساکن بێتو پیتەکەی پێشی ( ضمة ) یا (فتحە) ی هەبێت .

نموونە : ( غُـرْفَة ، قَرْية)

٣ ـ پیتی (را) ساکن بێتو پیتەکەی پێشی هەمزەی وەسڵ بێت.

نموونە : ( أمِ ارْتابوا ، ارْجعوا ، إنِ ارْتَبْتُمْ ، وَ ارْكعوا)

٤ ـ پیتی (را) ساكن بێتو پیتەكەی پێشی ژێری ئەسڵی خۆی هەبێتو پیتەكەی دوای پیتێكی (استعلاء)ی ژێردار نەبێت، كە بریتین لە (خص ضغط قِظ) وە ئەمە لەیەك وشەدا بێت .

نموونە : ( قِرْطاس ،مِرْصاداً ، فِرْقَة ، و إِرْصاداً ، لَبِالمِرْصاد )

تێبینی : تەنها هەر ئەم پێنج وشەیەش هەیە لەم شێوەیە لە قورئاندا .

بەڵام ئەگەر ئەو مەرجانەی باسمان كردن هەبێت، بەڵام پیتە (إستعلاء) ــە كە لە وشەیەكی دیكەدا بێت واتە لەناو یەك وشەدا نەبن، ئەوكاتە پیتی (را) بەباریكی دەخوێنرێتەوە. نموونە : ( أَنذِرْ قَومَكَ ، وَلا تُصعِّرْ خَدَّك )

٥ ـ پیتی (را) بكەوێتە كۆتایی وشە ، وە لەسەری بوەستین و بیكەین بە ساكن ، وە پیتەكەی پێشیشی سكوندار بێت بەڵام نابێت ئەم پیتە ساكنە پیتی (یا) بێت ، وە هەوەرها پێش ئەم پیتی ساكنە ( ضمة) یا (فتحە) هەبێت .

نموونە : ( في ليلةِ القَدْرِ ، وَالعَصْـرِ ، مع العُسْـرِ ،عزمِ الأمُوْرِ ،غَفَّاْرٌ ، النُّوْرُ )

## دووەم : باریك كردن ( بچووك) الترقيق

پیتی (را) بە باریكی دەخوێندرێتەوە كاتێك:

١ ـ پیتی (را) ژێری (كسرە )هەبێت. نموونە : ( رِزقاً )

٢ ـ پیتی (را) ساكن بێتو پیتەكەی پێشی ژێرە ی (كسرە) ئەسڵی خۆی هەبێتو، یەكێك لە پیتەكانی (إستعلاء)ی بەدوادا نەهاتبێت.

نموونە : ( مِـــرْيَةٌ ، شِـرْعَة ، شِـــرْذِمَة ، فِرْعَون )

٣ ـ پیتی (را) بكەوێتە كۆتایی وشەو لەسەری بوەستینو بیكەین بە ساكنو پێش سكونەكەش پیتی (یا ) ی ساكن هەبێت. نموونە : ( خَبِيــرٌ ، بَصيـــرٌ ،خَيْرٌ )

٤ ـ پيتی (را) بكەوێتە كۆتايی وشە و لەسەری بوەستين‌و بيكەين بە ساكن و لە پێشيشيەوە پيتێكی سكوندار هەبێت، بەڵام (إستعلاء) نەبێت‌و پێش ئەم پيتە سكوندارەش پيتێكی كەسرەدار هەبێت، نموونە :

( الـذِكْـــــرُ ، سِـحْـــــرٌ ، ... حِجْـــــرٍ )

٥ ـ پيتی (را) بكەوێتە كۆتايی وشە و لەسەری بوەستين‌و بيكەين بە ساكن و لە پێشيشيەوە پيتێكی كەسرەدار هەبێت ، ياخود پيتيی ( را ) لە كۆتايی ( فعلی أمر ) دا ساكن بێت و لە پێشيشيەوە پيتێكی كەسرەدار هەبێت، نموونە :

( مـنْـــذِرٌ ، المدَّثِـــــرُ ، قُـــدِرَ ، فَـــطَـــهِّـــرْ ، فأنْــذِرْ )

## خوێندنەوەی پيتی (را) بە هەردوو بار (جواز الوجهين)

دەتوانين پيتی (را) بە هەردوو شێوەی گەورەيی‌و بچووكی (باريكی) بخوێنينەوە كاتێك:

١ ـ پيتی (را) ساكن بێت‌و پيتەكەی پێشی ژێری ئەسڵی خۆی هەبێت‌و پيتەكەی دواشی پيتێكی (إستعلاء)ی كسرە بێت، نموونە : (كُلُّ فِرْقٍ) لە سورەتی الشعراء هەر ئەم وشەيەش لە قورئاندا هەيە ، دەتوانين ئەگەر لەسەری وەستاين يان نەوەستاين بە گەورەيی يان بە باريكی بيخوێنينەوە.

٢ ـ پيتی (را) بكەوێتە كۆتايی وشەو لەسەری وەستاين‌و كردمان بە ساكن، لە پێشيشيەوە پيتێكی (إستعلاء)ی ساكن هەبێت، پێش (إستعلاء)ـەكەش پيتێكی كسرە دار هەبێت، وەك (مِصْرَ، القِطْرِ). وا بەباش زانراوە كە (را)ی (مصر) بە گەورەيی‌و (را)ی (القطر) بە باريكی بخوێنرێتەوە كە كاتێك لە سەريان وەستاين .

٣ ـ لەم وشانەدا إذا يَسْرِ، أَنْ أَسْرِ، فَأَسْرِ، ونُذُرِ لە شەش شوێن لە سورەتی (القمر) ئەگەر لەسەريان وەستاين‌و كردمان بە ساكن دەتوانين (را) كە بە گەورەيی يان بە لاوازی بخوێنينەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەم وشانە لەدوای پيتی (را)يەكانيان يايەكی قرتێنراو (محذوف) يان هەيە.

# درێژكردنەوە (الـمـــــــد)

١. ماناى (مد) :

أ ـ لە زمانەوانيدا (فى اللغه) : واتە، درێژكردنەوە.

ب. لە زاراوەدا (فى الاصطلاح) : واتە، درێژكردنەوەى دەنگ لە كاتى دەربڕينى پيتەكانى (مد) كە بريتين لە (ـَ ا ، ـُ و ، ـِ ي ) (المصوت الطويل) يا پيتەكانى لين ( ـَ و، ـَ ي )

( ـَ ا) ئەليف پێشى فەتحە بريتيە لە دوو فتحة

( ـُ و) واو پێشى ضمە بريتيە لە دوو ضمة

( ـِ ي) يا پێشى كەسرە بريتيە لە دوو كسرە

٢. پيتەكانى (مد) (حروف المد) : پيتەكانى (مد) ژمارەيان سێ پيتە:

أ ـ ئەليفى زەنەدار كە پيتەكەى پێشى فتحة ى هەبێت: ( ـَ ا )

ب ـ واوى زەنەدار كە پيتەكەى پێشى ضمة ى هەبێت: ( ـُ و )

ج ـ يائى زەنەدار كە پيتەكەى پێشى كسرة ى هەبێت: ( ـِ ى )

٣ ـ جۆرەكانى (المد) : (مد) دوو جۆرە:

أ. الـمد الأصلي

ب. الـمد الفرعى

## أ ـ الـمد الأصلى

بريتيە لەو جۆرە (مد)ە ى كە بەهۆى هەبوونى يەكێك لە پيتەكانى (مد) لە وشـەدا دروســـت دەبێت ( ا، و، ى ) كە بـەو مەرجەى لە دواى پيتە مەديەكەوە همزه (ء) ياخود سـكون (پيتێكى سـاكن، زەنەدار) نەهاتبێت، وە ئەندازەى درێژكردنەوەكە دوو جوولەيە.

نموونە: ( قَالَ – يَقُولُ – قِيلَ)

## جۆرەكانى ( الـــمد الأصلي )

مەدى (أصلى) لە پێنج حاڵەت دا دروست دەبێت و پێویستە بە ئەندازەی دوو جووڵەدەنگ درێژ بکرێتەوە، ئەو پێنج حاڵەتەش ئەمانەن:

**١ـ المد الطبيعي الكلمي:** (درێژکردەوەی سروشتی)

**هۆكارى ناونانى:-** بۆیە پێی دەڵێن سروشتی چونکە کەسی خاوەن سروشتی تەندروست نە لە دوو جووڵە زیاتری دەداتێ نە کەمتر.

وسمي بالمدِّ الطبيعي: لأن صاحب الطبيعة السليمة لا ينقصه عن حدِّه ولا يزيد عليه في مقداره. وبالمدِّ الأصلي: لأنه أصل لجميع المدود

وە لەم جۆرەدا پیتەکانی (مد) دیارن و دەبینرێن.نموونە:( قَالَ – يَقُولُ – قِيلَ)

**٢ـ مَدُّ العِـــوَض:**(درێژکرنەوەی لە جیاتی)

هەرکاتێك لەسەر وشەیەك وەستای کە کۆتاییەکەی تنوینی نصب ( ـً ) بوو، ئەوکاتە تەنوینەکە کە بریتیە لە دەنگی نونێکی ساکن دەگۆڕدرێت بۆ دەنگی پیتێکی مەدی کە (ئەلیفە) وە بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە. وە بۆیە پێی دەوترێت عوض چونکە ئەم ئەلیفە مەدیە لە تعویضی نەوتنی دەنگی نونە ساکنەکەیە کە لەکاتی وەستاندا نونەکە ناخوێندرێتەوە . وە لە کاتی نەوەستاندا دەخوێندرێتەوە بە ڕەچاو کردنی ( أحكام النون الساكنة) .

تعريف مد العوض : مد العوض هو التعويض عن التنوين المنصوب عند الوقف عليه بألف مدية تمد بمقدار حركتين.

جێگەی ئاماژەیە تنوینی نصب لەم دوو حاڵەتەی خوارەوەدا کە لەسەریان دەوەستی دەبێت بە مدى عوض:

١. لەسەر ئەلیف، نموونە: (أفواجاً)، لەکاتی وەستاندا دەخوێنرێتەوە بە (أفواجا) ، یا خود ( هدًى) دەخوێنرێتەوە بە (هُدَا) وە دوو جووڵە دەنگ درێژ دەکرێتەوە.

٢. لەسەر همزە، نموونە: (ماءً) لەکاتی وەستاندا دەخوێندرێتەوە بە (ماءا) وە دوو جووڵە دەنگ درێژ دەکرێتەوە.

**تێ بینی:** ئەگەر لەسەر تنوینی (أفواجاً، ماءً) نەوەستای ئەوا دەنگی نونی ساکنمان دەبێتە ( أَفْواجَنْ ، ماءَنْ ) وە بە ڕەچاو کردنی ( أحكام النون الساكنة) نونەکە دەگونجێنین لە گەڵ دوای خۆیدا. بەڵام کە دەوەستی ئەوا لە بری نونەکە ئەلیفی مەدی بە دوو جووڵە دەڵێیت.

٣ـ مد الصلة الصغرى :(مەدی ڕاناوی لكاوی بچووك):

ئەم مەدە بریتیە لە ڕاناو (ضمیر) كە بۆ تاكی نێری نادیار بەكاردێت (هاء الضمیر للمذكر الغائب المفرد). ئەم ڕاناوە دوو مەرجی دەوێت تا ببێتە مەد:

یەكەم : دەبێت (متحرك) بێت بە ( ـُـ) ضمه، یاخود ( ـِـ ) كسرة.

دووهەم: دەبێت پێش ڕاناوەكەو دوای ڕاناوەكە متحرك بن. واتە ساكن نەبن. ئەگەر یەكێكیان ساكن بوو ئەوا نابێتە مەد.

تێبینی: ئەگەر پیتی دوای ضمیرە كە (ء) هەمزە نەبوو ئەوا ئەم مەدە پێی دەوترێت (مد الصلة الصغرى). وە بە ئەندازەی دوو جـوولە (ضمه) ی ( ـهُ ) دریـــژ دەكەینەوە، كە بریتیە لە (واو) ێكی مەدی ، یاخود (كسرە)ی ( ـهِ ) درێژ دەكەینەوە، كە بریتیە لە (یای) ێكی مدی شاردراوە لەناو دەنگی ضمیرە متحركەكەدا .

نموونە: (ومزاجُهُ و مِن تسنیم ) دەخوێندرێتەوە ( ومزاجُهوْ (دوو جووڵە) من تسنیم )

(كنتم بِـهِ ي تُكذبون) دەخوێندرێتەوە (بِـهيْ يْ (دوو جووڵە) تكذبون)

تێبینی: دەبینین (ها) لە ( مزاجهُ ، بهِ )متحركە بە (ضمه) یاخود (كسره)، وە كەوتۆتە نێوان دوو متحركەوە، لە دوایەوە همزە (ء) نەهاتوە، كەواتە ئەم حاڵە پێی دەوترێت (مد الصلة الصغرى). وە بە ئەندازەی دوو جووڵە دەنگ درێژ دەكرێتەوە.

٤ـ مد الطبیعی الحرفي، وە ناوێكی تری هەیە (مد الألفات): كە بریتیە لە وتنی پیتێكی مەدی كە ئەویش پیتی (ئەلیفە) كە لە كاتی وتنی پێنج پیت لە قورئاندا دەنگەكەی دەردەكەوێت وە بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژ دەكرێتەوە، ئەم مەدە لە كاتی خوێندنەوەدا ئاشكرا دەبێت و لە نوسیندا نادیارە واتە نانوسرێت، ئەو پێنج پیتەش ئەمانەن :

( ح ، ي ، ط ، هـ ، ر ) كە لە ڕستەی (حَيٌّ طَهُر) كۆ دەبێتەوە.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نموونە: | حـم | یـس | طـه | الـــــــر |
| دەخوێندرێتەوە : | حـــامیم، | یــاسین، | طــاهــا، | الف لام را |
| | دووجووڵە | دووجووڵە | دووجووڵە | دوو جووڵە |

**٤ـ مد التمكين: بريتيه لەو مەدەی كە پێویستە بە ( إتمام) واتە : تەواوی و دوور لە إدغام كردن وە بە (تمكين) واتە : بە ڕوونی و دوور لە ون كردن ، وە بە ئەندازەی دوو جووڵە درێژ بكرێتەوە بە مەبەستی جیا كردنەوەی دوو (یا) یاخود دوو (واو) لە پێناو جوان دەركەوتنی پیتە مەدیەكە. مەدی تمكين بەم شێوازانەی لای خوارەوەیە:**

**١ـ (يِّ+يْ) : ( يا)ی ساكن لە پێشیەوە (یا) ی شەددەداری مكسور هاتبێت.**

**نموونە: ﴿حُيِّيتُمْ﴾ ﴿ نَبِيِّينَ﴾**

**مدی تمكين مدی تمكين**

**دووجووڵە دووجووڵە**

**تێبینی : ئەم مەدە لەم نموونەیەدا و هاوشێوەی ئەم نموونەیە لەیەك وشەدا ڕوودەدات جا چ لەسەر حەرفی مەدەكە بوەستی یا خود نەوەستی ، دیارە لەم نموونەیەدا لەسەر حەرفەكە جێگەی وەستان نیە و ناكرێت بوەستی .**

**٢ـ (يِـ+يْ): (یا) یای ساكن لە پێشیەوە (یا) ی مكسوری بێ شەددە هاتبێت.**

**نموونە: ﴿يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ...﴾**

**مدی تمكين مدی تمكين**

**دووجووڵە دووجووڵە**

**تێبینی : ئەم مەدە لەم نموونەیەدا( يُحْيِي وَيُمِيتُ )و هاوشێوەی ئەم نموونەیە لەیەك وشەدا ڕوودەدات ، جا چ لەسەر حەرفی مەدەكە بوەستی یا خود نەوەستی،دیارە لەم نموونەیەدا لەسەر حەرفەكە دەكرێت بوەستی .**

**٣ ـ (يْ+يَ) ، (يْ+يُ) : (یا)ی ساكن لە دوایەوە (یا)ی متحرك بە (فتحە) هاتبێت یا(ضمە).**

**نموونە: ﴿فِي يَوْمَيْنِ﴾ ﴿ الَّذِي يُوَسْوِسُ﴾**

**مدی تمكين لە كاتی وەصلدا مدی تمكين لە كاتی وەصلدا**

**دووجووڵە دووجووڵە**

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر: ئەم دوو نموونەیەی سەرەوە كاتێك بە (یا) مەدیەكە دەوترێت مەدی تمكين كە لەسەر پیتە مەدیەكە نەوەستیت و وەصڵی بكەیت بە (یا) متحركەكەوە، ئەگەر وەستایت ئەوا پێی دەوترێت (المد الطبيعی) مەدی طبيعی.**

٤ ـ (وُ+ وْ) : (واو) ی ساكن له پێشیەوە (واو) ی متحرك هاتبێت به (ضمه).

نموونه: ﴿فَـأوُوْ﴾(مدى تمكين، دووجووڵه)

﴿ يَلْوُوْنَ﴾(مدى تمكين، دووجووڵه)

٥ـ (وْ + وَ): (واو)ی ساكن له دوایەوه (واو)ی متحرك هاتبێت به فتحه.

نموونه : ﴿ آمَنُوْا وَعَمِلُوا﴾ مدى تمكين له كاتی وەصلدا ، دووجووڵه

تێبینی بۆ زانیاری زیاتر : لەم نموونەیەدا كاتێك كه واوه ساكنەكه وەصلْ دەكەیت، لەو حاڵەتەدا واوه ساكنەكه پێ ی دەوترێت مەدی تمكين، بەلاّم كه وەقف كرا و له سەری وەستایت ئەوا پێ ی دەوترێت مدى طبیعی.

به كورتی : كەواته مدى تمكين بریتیه له كۆبونەوەی دوو (یا) یاخود دوو (واو)كه یەكێكیان ساكنه، وه لەو پێنج نموونەی سەرەوە دا دەبینرێت كه سیانیان كۆبونەوەی دوو (یا) یه، وه دوانیان كۆبوونەوە ی دوو (واو)ه.

سبب التسمية :وسمي مد تمكين لأنه يخرج متمكناً بسبب الشدة، ويمد مقدار حركتين.

## ب. الـــمد الفرعی

بریتیه لەو جۆرە (مد)ه ی كه به هۆی هەبوونی یەك له پیتەكانی مەد ( ا ، و ، ي ) لەوشەدا دروست دەبێت، وه بەو مەرجەی كه له دوای هەریەك لەو پیتانه یەكێكه لەم دوو هۆكاره بوونیان هەبێت. (ء) هەمزه، یاخود ( ـْـ ) سكون لەسەر پیتێك (پیتێكی ساكن) وه ئەندازەی درێژكردنەوەی دەنگ زیاتره له دوو جووڵه وه بەپێی جۆر و شوێنی مەدەكه ئەندازەكه دیاری دەكرێت كه دواتر لەگەڵ ناوی هەرجۆره مەدێكی فەرعیدا ئەندازەكەی ئاماژه پێ دەكەین. وه جۆرەكانی مەدی فەرعی زۆرن كه له خوارەوە ئاماژەیان پێ دەكەین.

ئەم پرسیاره بۆ زانیاری زیاتر :

سؤال :لِمَ زاد مقدار المد في المتصل على مقدار المد في المد الطبيعي؟
والجواب :لأن علة هذا المد أن حرف المد ضعيف، وبه صفة الخفاء، والهمزة ثقيلة في النطق؛ لأنها حرف شديد مجهور، فزيد المد قبلها للتمكُّن من النطق بحرف المد؛ صونًا له أن يسقط في القراءة لخفائه، وكذلك للتمكُّن من النطق بالهمزة لصعوبتها.

# جۆرەكانی ( المـــــد الفــرعی)

هەروەك باس كرا مەدی فەرعی بە هۆی هەبوونی یەكێك لەم دوو هۆكارە دروست دەبێت كە بەزۆری لە دوای پیتە مەدیەكەوە دێت كە بریتیە لە پیتی همزە (ء) یاخود پیتی ساكن (ــْـ) لەدوای پیتی مەدیەوە. لێرە بەجیا ئاماژە بە هەردوو هۆكارەكە دەكەین.

## ئەو مەدە فەرعیانەی كە بە هۆكاری همزە دروست دەبن چوار جۆرن

**١ـ المد المتصل (درێژكردنەوەی پێكەوە لكاو)**

بریتیە لەو مەدەی كە لە دوای پیتە مەدیەكەوە لە هەمان وشەدا پیتی هەمزە هاتبێت وە بە ئەندازەی چوار یا پێنج جوولە دەنگ درێژ دەكرێتەوە.

| نموونە: | ﴿ جَــاءَ ﴾ | ﴿سُوءَ ﴾ | ﴿ سِيـئَـتْ﴾ |
|---|---|---|---|
| | المد المتصل | المد المتصل | المد المتصل |
| | ٤ ، ٥ جوولە | ٤ ، ٥ جوولە | ٤ ، ٥ جوولە |

تێبینی: ئەگەر لە مەدی متصل دا پیتی هەمزە (ء) كەوتە كۆتایی پیتەوەو لەسەر پیتی هەمزەكە وەستا یت واتە، (وقف) روویدا، ڕێپێدراوە كە درێژی مەدەكە ببێت بە شەش جوولە وە هەروەها لەسەر همزەكە پێویستە یاسای (النبّر) جێبەجێ بكەین.

یاسای (النبّر): بریتیە لە فشار دروست كردن لە دەربڕینی دەنگی (همزە) كە ساكن كراوە.

وە دواتر باسی حوكمی نەبر دەكەین إن شاءالله .

**٢ـ المَدُّ المُنْفَصِلَ (درێژكردنەوەی پێكەوە نەلكاو، جیا)**

بریتیە لەو مەدەی كە لەدوای پیتە مەدیەكەوە لەوشەی دواتردا، واتە لە سەرەتای وشەی دوای پیتە مەدیەكەوە هەمزە هاتبێت وە ئەندازەی چوار یا پێنج جوولە دەنگ درێژ دەكرێتەوە لە كاتی وەصڵدا نەك وەقف.

| نموونە: | ﴿ إِنَّـا أَنزلناه ﴾ | ﴿ وتُوبوا إِلَى اللهِ﴾ | ﴿ وفـي أنفسكم﴾ |
|---|---|---|---|
| | المدالمنفصل | المد المنفصل | المد المنفصل |
| | ٤ ، ٥ جوولە | ٤ ، ٥ جوولە | ٤ ، ٥ جوولە |

## نموونەی زیاتر و هەندێك تێبینی دەربارەی مەدی منفصل

**نموونەی مەدی منفصل :** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ، يَٰٓـَٔادَمُ ، قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ، قُولُوٓاْ ءَامَنَّا ، إِنِّيٓ ءَامَنتُ، حَتَّىٰ يَأۡذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوۡ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ ﴾

**تێبینیەکان دەربارەی مەدی منفصل :**

أ ـ (يَٰٓأَيُّهَا، هَٰٓأَنتُمۡ، هَٰٓـؤُلَآءِ) هەریەکێك لەم وشانە پیتێکی مەدی تێدا دەرکراوەو لابراوە بەنوسین، بەڵام بە خوێندن دەخوێنرێتەوە، ئینجا هەر سێ ئەلیفە لابراوەکە مەدی منفصلن‌و جائیز نییە لەسەر بەشی یەکەمی ئەمانە بوەستیت واتە لەسەر (یا) یان (ها) لەبەرئەوەی ئەوانە بە وێنە وەك یەك وشە وان.

ب ـ لە وشەی (هَٰٓـؤُلَآءِ)مەددی یەکەم (منفصل)ەو مەددی دووەم (متصل)ە

ج ـ (ها) لە وشەی (هَـآؤُمُ) بۆ ئاگادارکردنەوە نییە، بەڵکو ئەم (ها)یە دوو پیتن لە ئەسڵ‌و بینچینەی وشەکەدان، بۆیە ئەو مەددەی تێیدایە مەدی (متصل)ەو مەددی (منفصل) نییە.

د ـ هەروەها (يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ) نابێت لێکیان جیابکەینەوە بەڵکو ئەگەر وەستاین پێویستە لەسەر (ءَادَمَ) بوەستین.

### ٣- مَدُّ الصلة الكُبــرى (مدی ڕاناوی لکاو، گەورە)

ئەم مەدە هەمان مدی صلەی بچووکە کە لە مەدە ئەصڵیەکاندا باسمان کرد، بەڵام جیاوازی ئەوەیە کە ئەم مەدە لە دوایەوە پیتی هەمزە(ء) هاتوە، وە بە ئەندازەی چوار یا پێنج جوولە درێژ دەکرێتەوە.

نموونە: ﴿وَلَـهُ أَجرٌ عظيم﴾(دەنگەکەی وَلَهُوْوْ ( مد الصله الكبرى ٤، ٥ جوولە) أجرٌعظيم)

﴿وَجْهــِهِ أَهْدَى﴾(دەنگەکەی وَجْهِهِيْ يْ (مد الصله الكبرى ٤ ، ٥ جوولە) أهدى)

تێبینی بۆ زانیاری زیاتر: هۆکاری ناونانی مەدی (صله) ئەوەیە کە لەکاتی وەصڵ کردنی پیتی (ها ـە) بەدوای خۆیەوە دروست دەبێت ، واتە وەقف نەکەین وە دەنگی (ضمير) بگەیەنین بەدوای خۆیەوە بەهۆی واو یاخود یایێکی مەدی لەکاتی وەصڵ دا.

والمقصود بالصلة : أن تشبع حركة الهاء فتوصل الهاء بواو ممدودة مقدار حركتين إن كانت مضمومة ، وبياء ممدودة مقدار حركتين إن كانت مكسورة وهذا إذا لم يقع بعدها همز فتكون حينئذ من أحكام المد المنفصل.
يقول الإمام أبو شامة : ووجه الصلة : أن الهاء حرف خفي فقوى بالصلة بحرف من جنس حركته ـ يقصد بالحرف : الواو أو الياء ـ ولأن هاء الضمير اسم على حرف واحد فناسب أن تقوى .

**٤ ـ مد البدل (درێژكردنەوەی برێتی)**

ئەم مەدە بریتیە لەو جۆرە مەدەی كە لە كۆمەڵێك وشەدا دەبینرێت (اسم، فعل) واتە ئەو وشانەی كە لەبنەڕەتدا لە سەرەتای وشەكەوە دوو هەمزە هەبوو كە هەمزەی یەكەم متحركە و همزەی دووهەم ساكنە، وە خوێندنەوەی دوو هەمزە بە دوای یەكتردا كە یەكەم متحرك و دووهەم ساكن بێت قورسە لەسەر زمان، هەمزەی دووهەم كراوە بە پیتێكی مەدی، لە جۆری جووڵەی هەمزەی یەكەم بەم شێوەیە:
ئەگەر هەمزەی یەكەم فتحەی هەبێت ئەوا هەمزەی دووهەم دەكرێت بە ئەلیف وە ئەگەر یەكەم ضمة ی هەبێت ئەوا دووهەم دەكرێت بە واو وە ئەگەر یەكەم كسرە ی هەبێت ئەوا دووهەم دەكرێت بە یاء، وەبە ئەندازەی دوو جووڵە دەنگ درێژ دەكرێتەوە.
نموونە:

فتحة و سكون : أأدم : ءَادم          أأمنوا: ءَامنوا مدی بدل ، دوو جووڵە
ضمة و سكون : أأتوا : أُوتوا      أأتِي : أُوتِي مدی بدل ، دوو جووڵە
كسرة و سكون : إألاف : إِيلاف     إأمان : إِيمان مدی بدل ، دوو جووڵە

تێبینی : هەندێ وشە هەن وەك (لَيَئوس، الضمئان، باؤوا،قرءان، مسئولا، إسراءيل، نبئوني، ءاباءهم) لە دوای پیتی هەمزەوە پیتێكی مەدی هاتوە، بەڵام ئەو پیتە مەدە لە بنەڕەتدا هەمزە نیە و ئەم جۆرە پێ ی دەوترێ (مدی شبیه بالبدل) بەڵام لەبەر هاوشێوە بوونی لەگەڵ مدی بدل دا بەم جۆرەش دەوترێت مدی بدل و ئەم ناوە ڕێپێدراوە.

## ناوی ئەو مەدە فەرعیانەی کە بە هۆکاری دووهەم واتە هەبوونی پیتێکی زەنەدار (سکون) دروست دەبن بەم شێوازەی لای خوارەوەیە

**جا لێرەدا پێویستە بزانین کە (سکون) دەبێت بە دوو جۆر:**

**جۆری یەکەم: سکونەکە دەکرێت أصلی بێت و لەسەر پیتەکە دیار بێت، یاخود لە حەرفێکی شەددە داردا بێت و دیار نەبێت.**

**جۆری دووهەم: سکونەکە دەکرێت أصلی نەبێت بە هۆی وەستان لەسەر پیتەکە بە دەنگ سکون دروست بکەیت.**

## لە خوارەوە ئاماژە بە هاتنی هەردوو جۆرە سکونەکە دەکەین:

**ئەو مەدانەی کە بەهۆی سکونی أصلیەوە دروست دەبن پێنج مەدن کە ئەمانەن:**

### ١ـ المد اللازمُ الكلميُّ الـمُثـقـّل

**بریتیە لەو مەدەی کە لە دوای پیتی مەدیەوە زەنە (سکون) هاتبێت وە سکونەکەش لەناو پیتێکی شەددەداردا بێت، ئەوا بە ئەندازەی شەش جووڵە دەنگ درێژدەکرێتەوە .**

**نموونە:** الضَّآلِّين : الضّالْلِين
**(مدی لازمی کلمی مثقل)**
**شەش جووڵە**

تَأمُرُونـِّي : تَأمُرُونْنـِي
**(مدی لازمی کلمی مثقل)**
**شەش جووڵە**

**تێبینی : نموونەی (مدی کلمی مثقل) بۆ پیتی (یا) لە قورئاندا نەهاتوە.**

### ٢ـ المد اللازمُ الكلميُّ الـمُخَفَف

**ئەم مەدە بریتیە لەو جۆرە مەدەی کە لە دوای پیتە مەدیەکەوە پیتێکی ساکن هاتبێت، وە ئەو پیتە ساکنە لەناو پیتێکی شەددەدار نەبێت، وە سکونەکە لەسەر پیتەکە ببینرێت ئەوا بە ئەندازەی شەش جووڵە دەنگ درێژ دەکرێتەوە . وە ئەم جۆرە تەنها لەیەك وشەدا هاتوە لە قورئاندا کە دوو جار دوبارە بۆتەوە لە سورەتی یونس دا لە ئایەتی (٥١) و (٩١).**

**نموونە:** ءآلْئن مدی لازمی کلمی مخفف / شەش جووڵە

## ٣ـ المد اللازمُ الحرفيُّ المُثقّل

ئەم مەدە پەیوەندی بە پیتەکانی سەرەتای هەندێك لە سورەتەکانەوەیە کە چواردە پیتن وە بە دووبارە بوونەوەی هەندێکیان بیست و نۆ سورەت بەم پیتانە دەست پێدەکات وە لە ڕستەی (نَصٌ حكيمٌ قاطعٌ له سِرٌ) کورت بونەتەوە.




ئەم پیتانەش بەگوێرەی ئەو مەدانەی کە تیایاندایە دەکرێن بە چواربەشەوە:

**یەکەم :ئەو پیتانەی مەدییان تێدا نییە**

یەك پیت لەم چواردە پیتە مەددی تێدا نییە، ئەویش پیتی (ا) هەرچەندە لەکاتی خوێندنەوەدا بە سێ پیت دەخوێنرێتەوە بەم جۆرە (أَلِفْ) بەڵام درێژناکرێتەوە چونکە پیتی مەددی تێدا نییە، پێویستە ئاگاداری ئەوەش بین لامی ئەم پیتەکە بە کەسرەداری دەخوێنرێتەوە واتە (أَلِف)، چونکە ئەگەر لامەکەی بە سکونداری بخوێنرێتەوە بەم شێوەیە (أَلْف) واتە هەزار، ئەوا ماناکەی دەگۆڕێت بۆ ژمارە، ئەم جۆرە خوێندنەوەیەش هەڵەیە.

**دووەم : ئەو پیتانەی مەدەکانیان بە ئەندازەی دوو جوڵە درێژدەکرێنەوە**

پێنج پیت لەم چواردە پیتە کە بریتین لە (ح، ي، ط، هـ، ر) لە هەردوو وشەی (حَيّ طُهرُ) کۆدەبنەوە، هەریەکەیان بە دوو پیت دەخوێنرێتەوەو پیتی دووەمیان پیتی مەدە، بەم جۆرە (حا، یا، طا، ها، را) ئەلیفەکانیان بە ئەندازەی دوو جوڵە وەکو مەدێکی ئاسایی درێژدەکرێنەوە.

**سێیەم :ئەو پیتانەی مەدەکانیان بە ئەندازەی شەش جوڵە درێژدەکرێنەوە**

حەوت پیت لەو چواردە پیتە کە بریتین لە (س، ن، ق ، ص، ل، ك، م) کە لە وشەی (سَنَقُصُ لَكُم)دا کۆدەبنەوە، هەریەکێك لەم پیتانە بە سێ پیت دەخوێنرێتەوەو ناوەندەکانیان پیتی مەدد (درێژکردنەوەن) بەم شێوەیە (سین، نون، قاف ، صاد، لام، کاف، میم) ئەمانە مەددەکانیان بە ئەندازەی شەش حەرەکە وەکو مەدی لازم درێژ دەکرێنەوە

**چوارەم :ئەو پیتانەی مەدەکانیان بە ئەندازەی ٤ یان ٦ جوڵە درێژدەکرێنەوە**

یەك پیت لەو چواردە پیتە کە (ع)ە بەسێ پیت دەخوێنرێتەوەو ناوەندەکەی پیتێکی مەددی لینە، بەم شێوەیە (عَیْن) بە ئەندازەی (٤ یان ٦) حەرەکە وەکو مەدی لین درێژدەکرێتەوە (من طريق الشاطبية) ئەمەش لە دوو شوێن لە قورئاندا هەیە، سورەتی (مریم١، سورەتی شوری ١، ٢)

ئەم مەدە کاتێك دروست دەبێت کە پیتەکە دەخوێنرێتەوە، واتە ناوەکەی دەڵێیت، بۆ نموونە، لە سەرەتای سورەتی البقره (الـم) هاتوە، کاتێك دەمانەوێت ئەم سێ پیتە بخوێنینەوە دەڵێین:

(الف لآمْ میم) لێرەدا دەبنین لە پیتی (لآمْ) حەرفی مەد هەیە و لە دواوە (مْ) ساکنە، وە بە شێوێنیدا (میم) هاتوە کە یەکەم پیتی (مِیم)ـەکە متحرکە و کسرە ی هەیە( لآمْ مِیم )، کە واتە میمی ساکن و میمی متحرك تێکهەڵکێش دەکرێن (الإدغام)وە دەبن بە میمێکی شەددەدار. بۆیە بە ئەلیفی ناو (لام) دەوترێت (المد اللازم المثقل الحرفي) چونکە سکونە ئەصلیەکە لە میمێکی شەدەدارادایە کە بە دەنگ دەردەکەوێت نەك بە نووسین وە ئەلیفەکە شەش جووڵە درێژ دەکرێتەوە، وە دوای ئەلیفەکە ڕاستەوخۆ إدغامی( کامل بغنه ) مان هەیە دوو جووڵە غونە دەکەین دواتر پیتی (میم) دەڵێین ئەویش بە شەشە جووڵە .

نموونە:

﴿ الم ﴾ : أَلِفْ لامْ مِيمْ (مدی لازمی حرفی مثقل) (البقرة) و (آل عمران) و (العنكبوت) و (الروم) و (لقمان) و (السجدة).




**ئەلیفەکە شەش جووڵە درێژ دەکرێتەوە ، دوای شەش جووڵەکە میمەکە بە شەدەوە دوو جووڵە مینگەی دەدەینێ چونکە إدغامی شفوی ڕوودەدات کە پێشی دەوترێ إدغامی متماثلین ، دواتر پیتی (یا) شەش جووڵە درێژدەکەینەوە کە ئەویش جۆرێکی ترە لە مەد دوای ئەمە باسی دەکەین إن شاء الله.**

﴿ المص ﴾: أَلِفْ لامْ مِيمْ صادْ (مدى لازمى حرفى مثقل) (الأعراف).

ئەليفەكە شەش جووڵە درێژ دەكرێتەوە ، دوای شەش جووڵەكە میمەكە بە شەدە و بە دوو جووڵە غونە دەڵێین چونكە إدغامی شفوی ڕوودەدات ، ...

﴿ طسم ﴾: طا سينْ مِيمْ (مدى لازمى حرفى مثقل) (الشعراء) و (القصص).

حەرفی (یا) شەش جووڵە درێژ دەكرێتەوە ، دوای شەش جووڵەكە میمەكە بە شەدە و بە دوو جووڵە غونە دەڵێین چونكە إدغامی حقیقی (نونی ساكن دەگات بە میم) ڕوودەدات

﴿المر﴾ : أَلِفْ لامْ مِيمْ را (مدى لازمى حرفى مثقل) (الرعد).

### ٤.المد اللازم الحرفي المخفف

ئەم مەدە بریتیە لەوەی كە لە پیتەكانی سەرەتای هەندێك سورەتدا هەن كەناوی پیتەكە لە سێ حرف پێك هاتبێت وە پیتی ناوەڕاستی حرفی مدی بێت یان لین بێت وە پیتی سێهەم ساكن بێت بە سكونی أصلی وە تێكهەڵكێش (الإدغام) نەكرێت لەگەڵ دوایدا. ئەوا پێویستە شەش جووڵە درێژ بكرێتەوە.

نموونە:

﴿الر﴾: أَلِفْ لامْ را (یەك مەدی تیایە لە جۆری مدی لازمی حرفی مخفف ، ئەلیفەكە شەش جووڵە درێژ دەكرێتەوە) (یونس) و (هود) و (یوسف) و (إبراهیم) و (الحجر).

﴿كهيعص﴾ كافْ ها يا عينْ صادْ (سێ مەدی تیایە لە جۆری مدی لازمی حرفی مخفف ، ئەلیف ی(ك)، یا ی (ع ) ، ئەلیف ی (ص) شەش جووڵە درێژ دەكرێنەوە) (مریم).

﴿طس﴾ طا سينْ (یەك مەدی تیایە لە جۆری مدی لازمی حرفی مخفف ، پیتی (یا) شەش جووڵە درێژ دەكرێتەوە) (النمل).

﴿يس﴾ يا سينْ (یەك مەدی تیایە لە جۆری مدی لازمی حرفی مخفف ، پیتی (یا) شەش جووڵە درێژ دەكرێتەوە) (یس).

﴿ص﴾ صادْ (ص). ﴿ق﴾ قافْ (ق). ﴿ن﴾ نونْ (القلم).

﴿حم﴾ حا ميم (غافر) و (فصلت) و (الزخرف) و (الدخان) و (الجاثية) و (الأحقاف).

﴿حم عسق﴾ حا ميم عينْ سينْ قافْ (الشورى).

تێبینی: (عَيْنْ) لەدوو شوێندا بە شێوازی مەدی لازمی حرفی مخفف هاتوە، لە ڕاستیدا پیتی ناوەڕاست حەرفی لینە بۆیە لێرەدا ڕێپێدراوە بە شەش جووڵە وە بە چوار جووڵە، وە شەش جووڵە هەڵبژاردەی یەکەمە وە ئەم مەدە پێی دەوترێت (مد اللين اللازم)، چونکە پیتی سێهەم سکونەکەی أصليه، بەڵام مدی لینی عارض للسكونیشمان هەیە وەکو (خَوْف)،(قرَيْش) پێی دەوترێت (مد اللين العارض للسكون) چونکە سکونەکە بەهۆی وەستانەوە دروست دەبێت.

## ٥ـ مَدُّ الفَــرْق (مەدی جیاوازی یان جیاکەرەوە):

ئەم مەدە کاتێك دروست دەبێت کە (ء) هەمزەی پرسیار (همزة الاستفهام) بچێتە سەر هەر ناوێك کە بە (الـ) ئەلیف و لام دەستی پێکردبێت ئەو کاتە همزەی پێش لامەکە کە لە جۆری هەمزەی وەصلە دەکرێت بە ئەلیفی مەدی و شەش جووڵەی پێویستە دەنگ درێژ دەکرێتەوە. وە هۆکاری ناونانی بە (فَرْق) ئەوەیە کە ڕستەکە لە جۆی ڕستەی خەبەری جیا دەکاتەوە و بەو شێوەیەی کە مەبەستە بە ڕستەی پرسیاری دەیهێڵێتەوە. چونکە بەم همزەیە پرسیار دەکرێت و جیا دەبێتەوە لەوەی کە هەواڵ بگەیەنێت، وە بۆ ئەوەی ئەم ئامانجە بێتە دی هەمزەی پێش لامەکە دەکرێت بە حەرفی مەدی شەش جووڵە، ئەگەر وانەکەرێت ئەوا لە نێوان ئەو دوو جۆرە ڕستەیەدا تێکەڵ بوون ڕوودەدات و گوێگر لەلای ڕوون نیە ڕستەکە هەواڵە یان پرسیار.وە ڕێپێدراوە ئەم همزەیە بە تسهیل بخوێندرێتەوە ، واتە لە نێوا همزة و ألف دا .

نموونە : ﴿ءآلذَّكريْنِ﴾ ﴿قل ءآللهُ أذِنَ لكم﴾، ﴿ءآللهُ خيرٌ أمّا تشركون﴾ ﴿ءآلْئن﴾

تعريف مد الفرق : وهو عندما تدخل همزة الاستفهام على اسم معرف ب : "الــ" التعريف، تبدل ألف "الـــ"التعريف، ألفاً مدية ليفرق بين الاستفهام والخبر .

هو إبدال همزة الوصل مع إشباع المد في هذه المواضع الثلاثة:

أ -قوله تعالى ﴿ءآلذَّكريْنِ﴾ في موضعين من سورة الأنعام (آية ١٤٣، ١٤٤ )

ب -قوله تعالى ﴿ءآللهُ ﴾في موضعين (سورة النمل آية ٥٩)، (سورة يونس آية ٥٩)

ج -قوله تعالى ﴿ءآلْئن ﴾في موضعين من سورة يونس (آية ٥١، آية ٩١ )

ومدالفرق مقداره ست حركات، وحكمه الوجوب؛ فهو من قبيل المد اللازم الكلمي، وإنَّما سمي بهذا؛ لأنه يفرق به بين الخبر والاستفهام .هذا، وتجوز القراءة بتسهيل الهمزة الثانية بين بين ، بغير مد ، في المواضع السابقة.

**ئەو مەدانەی کە بەهۆی سکونی کاتیەوە دروست دەبن دوو دانەن کە ئەمانەن:**

**ئەویش کاتێك دەبێت کە لەسەر کۆتایی وشەکە بوەستیت ساکنی بکەیت و پێشی ساکنەکە حرفی مد بێت. کە دوو یان چوار یان شەش جووڵە (٢ ، ٤ ، ٦ )درێژ دەکرێتەوە.**

### ١ـ المد العارض للسكون

**نموونە بۆ مد العارض للسكون :**

**﴿والتينِ و الزيتونِ﴾ : و الزيتونْ : کەلەسەر نونەکە دەوەستی و بەدەنگ ساکنی دەکەیت مەدی عارض للسکون دروست دەبێت ، کە دوو یان چوار یان شەش جووڵە (٢ ، ٤ ، ٦ )درێژ دەکرێتەوە ، وە باشترە (٦) جووڵە بێت .**

### ٢ـ المد اللين

**نموونە بۆ مدی اللين :**

﴿خَوْف، قُرَيْش، الصَيْف، شَيْء﴾

**ئەم مەدە کە کاتێك دروست دەبێت کە دوو پیتی (واو)، یا خود پیتی (یا) ساکن بن و پێشەکەیان فتحە بێت ( ـَ وْ ، ـَ یْ)، وە سیفەتی لین وەردەگرن هەربۆیە ئەگەر لە سەر پیتی دوای خۆیان وەستایت ئەوا (٢ ، ٤ ، ٦ )جووڵە دەنگی (واو)، یا خود پیتی (یا) درێژ دەکرێتەوە.**

## بەهێز ترین مەد

**ئەگەر لەیەك هۆی درێژکردنەوە زیاتر لەسەر پیتێکی مەد کۆبوونەوە ئەوکاتە کار بە بەهێزترینیان دەکەین، بەڵام ئەگەر هۆیەکان یەکسان بوون ئەوە کار بە هەردووکیان دەکرێت.**

بەهێزترین مەد (مد اللازم)ە چونکە کۆدەنگی هەیە لە سەر درێژکردنەوەو ماوەی درێژکردنەوەکەی کەشەش جوولەیە.

لە پلەی دووەمد (مد المتصل) چونکە کۆدەنگی هەیە لەسەر درێژکردنەوەی بەبێ دیاریکردنی ماوەی درێژکردنەوەکەی.

پاشان (مد العارض) دواتر (مد المنفصل) و لە کۆتاییشدا (البدل)

لەم دوودێڕە هۆنراوەیەدا ئاماژەی پێکراوە :

أقوى المدودِ لازمٌ فما اتصل      فعارضٌ فذو انفصالٍ فبدل
و سببـــا مـدٍ إذا ما وُجِـدا      فإن أقوى السببين انفـــردا

نموونە : لازم + بدل = ءآمِّينَ ، متصل + بدل = رِئَآءَ ، منفصل+ بدل = رءآ أيديهم ، متصل+ عارض = السمآء ، متصل+ بدل + عارض = السمآء ، لازم + بدل = رِئَآءَ

## بەیەك گەیشتنی دووپیتی سکوندار
## إلتقاء الحرفين الساكنين

یەکەم : درووستە کۆبوونەوەی دووپیتی ساکن لەیەك وشەدا لە دووشوێندا :

أ ـ ئەگەر پیتی ساکنی یەکەم پیتێکی مەدی یا لین بوو .

نموونە : الضَّالِّين = الضّـاْلْـلِين ، أتُحجُّونّـِي = أتحـاْجْـجُونِّي
يس = يـاســِيْــنْ ، ن = نُــوْنْ ، ع = عَيْــنْ

ب ـ ئەگەر سکونی پیتی دووەم (عارض) بوو :

الحسابُ = الحساْبْ ، تعلمونَ = تعلموْنْ ، خَوْفٌ = خَوْفْ

**دووەم : ئەگەر دووسکون لە دوای یەك هاتن بەڵام لە دوو وشەدا بوون بەم جۆرەی لای خوارەوە کە لە خشتەکەدا هاتوو مامەڵەیان لە گەڵ دەکەین :**

| ژ | نموونەی کۆ بوونەوەی دوو ساکن لە دوو وشەدا | چۆنیەتی خوێندنەوەکەی | ڕوون کردنەوە |
|---|---|---|---|
| ١ | مِــنْ الْــجِنَّةِ<br>فَمِنْ اللَّه ( اللّلَاــهِ ) | مِــنَ الْــجِنَّةِ<br>فَمِنَ اللَّه | ئەگەر ساکنی یەکەم (نْ)بوو لە حەرفی جەڕ(مِنْ)دا ئەوا دەیکەین بە فتحە ئەمەش لە کاتێکدایە کە(مِنْ)لە دوایەوە هەمزەی وەصل بێت |
| ٢ | عليكمْ الْمنَّ و السَّلوى<br>عليكمْ الصِّيام<br>ءاتَوْا الزَّكاة | عليكمُ الْمنَّ و السَّلوى<br>عليكمُ<br>الصِّصِيام(الصِّيام)<br>ءاتَوُا الزْزكاة (الزَّكاة) | ئەگەر ساکنی یەکەم (میم) ی جمع ، یا خود (واو) ی جمع کە فتحەی لەپێشەوەبێت ، ساکنی تر هات بە دوایاندا ئەوا سکونی (میم) و (واو) ـەکە دەکرێت بە ضمة ، ئەمەش لە کاتێکدایە کە لە دوای (میم) و (واو) ەکەوە هەمزەی وەصل بێت . |
| ٣ | و قالتْ اخْرُج<br>أنْ اضْرِب<br>......<br>أحدٌ ، اللهُ | و قالتِ اخْرُج<br>أنِ اضْرِب<br><br>أَحَدُنِ اللَّه | جگە لە حاڵەتی ژمارە (١) و (٢) هەرکاتێك دووساکن بە یەك گەیشتن ئەوا یەکەمیان دەکەین بە کسرة .<br>هەروەها تنوین لەپێش همزەی وەصل دەکرێت بە نوونێکی کسرة دار . |
| ٤ | ءَامنوا اتَّقُوا الله (اتْتَقوا)<br>اهدِنَا الصِّرطَ<br>(الصْصِراط)<br>وَالمُقِيمِــي الصّلوةِ<br>( الصْصَلوة) | آمنُ اتقُ الله<br>اهدنَ الصِّراط<br>والمقيمِ الصَّلاة | (حذف حرف المد لإلتقاء الساكنين)<br>نەخوێندنەوەی پیتی مەد لەکاتی بەیەکگەیشتنی دوو پیتی سکونداردا<br>ئەگەر وشەیەك کۆتاییەکەی پیتێکی مەددی بوو گەیاندمان بە وشەیەکی دیکە کە یەکەم پیتی ساکن بوو ئەوکاتە پیتە مەددییەکە ناخوێندرێتەوە لەبەر بەیەك گەیشتنی دوو پیتی سکوندار. |

# شێوازەکانی وەستان

سێ شێوازی وەستان هەیە لەکاتی قورئان خوێندندا

١ ـ (قطع) وازهێنان لە قورئان خوێندن.

ئەمە کاتێکە کە کۆتایی بە خوێندنەوەی قورئان دێنیت.

٢ ـ (وقف) وەستان لە کۆتایی ئایەتەکان بە هەناسە.

ئەم جۆرە کاتێکە کە لە کۆتایی ئایەتەکان یا خود کۆتایی ڕستە ئەندازێکی کەم بۆ هەناسە وەرگرتن دەوستیت  بە مەبەستی بەردەوام بوون لە خوێندنی قورئان .

٣ ـ سەکتە وەستانە بەبێ هەناسە

وەستان بە ئەندازەی دوو جوڵە (دوو حەرەکە) بەبێ هەناسەدان وە ڕاستەوخۆ بەردەوام بوون لە سەر خوێندنەکە.

## سەکتە

## شوێنەکانی سەکتە لە قورئاندا

پێناسەکەی : سەکتە بریتییە لە وەستانێکی کەم بەبێ هەناسەدان بەئەندازەی دوو حەرەکە بەمەبەستی بەردەوام بوون لەسەر خوێندنی قورئان.

لەڕیوایەتی(حفص عن عاصم) لە شەش شوێنی قورئاندا سەکتە دەکرێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە :

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی سەکتە کردن واجبە لەم چوار شوێنە لە قورئاندا.

١ ـ نێوانی دوو وشەی (عِوَجاً) و (قَيِّـماً) لە سورەتی الكهف( ١ ـ ٢ )

٢ ـ نێوانی دوو وشەی (مَرقَدنا) و (هذا) لە سورەتی يس (٥٢)

٣ ـ نێوانی دوو وشەی (مَنْ) و (راقٍ) لە سورەتی القيامه( ٢٧)

٤ ـ نێوانی دوو وشەی (بلْ) و (رانَ) لە سورەتی المطففين (١٤)

زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر دوو شوێنەکەی تر کە سەکتە کردن تیایدا واجب بێت یان نا ، ئەویش ئەم دوو شوێنەی لای خوارەوەن :

٥ ـ نێوانی سورەتی (الأنفال) و (التوبة) جگە لە سکتە، گەیاندن ( الوصل)و وەستان(الوقف) تێیدا جائزە  وەك پێشتر باسکرا.

٦ ـ نێوانی دوو وشەی (ماليه) و (هلك) لە سورەتی (الحاقه)، جگە لە سەکتە دوو ڕوی

**دیکەی تێدا جائزە، ئەوانیش تێکهەڵکێشان ( الإدغام)و وەستان (الوقف).**

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**١ - وشەی (عوجاً) کەوتۆتە کۆتایی ئایەتو (مرقدنا) کۆتایی قسەی کافرانە، لەبەرئەوە جائزە لەسەریان بوەستیت بە وەستانی تەواو (الوقف التام)، دەشتوانیت بیگەیەنیت بەوەی دواوە بە سەکتە.**

**٢ ـ بەڵام (من راق) و (بل ران) جائز نییە وەستان لەسەر (مَنْ) و (بَلْ) لەبەرئەوە شوێنی وەستان (وقف) نین، بەڵکو پێویستە (سکتە)ی تێدا بکرێتو ئاشکرا بکرێن، واتە لامو نوونەکە دەغم نەکرێن لەگەڵ (را) کە لە دوایان دێت.**



# چۆنیەتی خوێندنەوەی چەند وشەیەك لە قورئاندا

ئەم بابەتە لە خۆگری کۆمەڵێك زاراوەیە کە لە خوێندنی قیرائەتە جۆراو جۆرەکانی قورئاندا باسیان لێدەکرێت و بەکار دێن ، وە لە قیرائەتی ئیمامی عاصم دا هەندێك لەو زاراوانە بوونیان هەیە و چەند وشەیەکیان پێ دەخوێندرێتەوە کەپێویستە قورئان خوێن ئاگاداریان بێت و جێ بەجێیان بکات ، وەك ئەمانەی لای خوارەوە :

## ١ ـ الإشمام :

**لە زمانەوانیدا** : شمّ الشيءَ يشمُهُ ، واتە بۆن کردن ، بریتیە لە خڕکردنەوەی شێوەی لێوەکان ، وەك شێوەی بۆن کردنی گوڵێك یا بۆنێکی خۆش .

**لە زاراوەدا** : قال إبن الجزرى : ( الإشمام حالة من حالات الوقف في الكلمة المرفوعة و هي الوقوف على صوت دون إتباعة بضم الشفتين فقط، أو هو إشارة إلى حركة الرفع من غير صوت)

دەربڕینی شێوەی ضمة یە بە خڕکردنەوەی لێوەکان لە کاتی وتندا بە بێ هەبوونی دەنگ وە تایبەتە تەنها بە جووڵەی (ضمة) . وە ئەم حاڵەتی (إشمام ) ــە لەم کاتانەدا بەکاردێت :

أ ـ کاتێك وشەیەك کۆتا پیتی ضمة یە و لەسەر کۆتا پیت دەوەستیت و ساکنی دەکەیت ، دوای ئەوەی سکونەکەت وت ڕاستەوخۆ شێوەی لێوەکان خڕدەکەیتەوە (إشمام) ی دەکەیت بەمەبەستی ئەوەی کە ئاماژە بێت بەوەی کە کۆتا پیت پێشتر ضمة ی هەبوە .

ئەم حاڵەتە تایبەتە بە کۆتا پیتی وشە کە مضموم بێت .

ب ـ بەڵام ئەم حاڵەتەلە وشەیەك لە ئایەتی (١١) سورەتی (یوسف)دا ﴿ تَأۡمَنَّا ﴾هاتووە کە پیتە مضمومةکە لە ناوەڕاستی وشەکەدایە ، لە بنەڕەتدا بەم شێوەیە (تَأْمَنُنَا) ، پێك هاتوە لە فعلێکی مضارع و فاعیلێکی شاراوە کە بۆ باوکی یوسف دەگەڕێتەوەو مفعول بە کە ڕاناوی (نا)یەو بۆ براکانی یوسف دەگەڕێتەوە.

عەرەب بۆیە ئەم وشەیە بەو شێوەیەی لە قورئاندا نوسراوە دەخوێننەوە لەبەر قورسی، چونکە سێ پیتی مینگەداری حەرەکەدار بەدوای یەکدا هاتوون، کە بریتین لە (میمو دوو نونەکە) ئینجا نونی یەکەم کراوە بە سکوندارو دەغم کراوە لەگەڵ نونی دووەم ( تَأمَنْنَا = تأمنَّا)و بەم شێوەیەی لێ هاتوە کە لە قورئاندا نوسراوە. (ئەم وشەیە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بەم شێوەیە نوسراوە کە ئێستا هەیە).

## ٢ـ الـرَوْم :

لەزمانەوانیدا : الطلب من الفعل

لە زاراوەدا : الإتيان ببعض الحركة ( ثلثها) بحيث يُسمع لها صوت خفي  يسمعه القريب دون البعيد و الأعمى بحاسة سمعه .

الرَوْم واتە: وتنی یەك بەش لە سێ بەشی جووڵەی ضمة یا كسرة بە خێرایی و بەكورتی بە شێوازێك كەتەنها كەسی نزیك دەیبیستێ ، وە لە فەتحەدا نە ڕەوم هەیە نە إشمام .

### سوودی ( إشمام ) و ( روم ):

لە م دوو حاڵەتەدا ڕوونكردنەوەی جووڵەی أصلی پیتەكەی تیادا دەردەكەوێت كە لەكاتی گەیاندندا بەڕوونی ئاشكرا دەبێت و جێگیرە ،

لە إشمام دا بینەر ئاگادار دەبێت لە أصلی جووڵەكە كە ضمة یە .

لە روم دا بیسەر ئاگادار دەبێت لە أصلی جووڵەی پیتەكە كە ضمة یا كسرة یە .

### ئەو شوێنانەی كە إشمام و روم ی تێدا قەدەغەیە

١ـ كاتێك پیتی كۆتایی فەتحەبێت یا تنوینی فتحە بێت ( الفتح و النصب)

نموونە : تعلمونَ ، سميعاً بصيراً

٢ ـ پیتی ساكن كەسكونەكەی أصلیە لە وصل ووقف دا . نموونە  : ( فحدِّثْ) ( فاهجُرْ)

٣ـ پیتێكی ساكن حەرەكەی عارضی وەرگرتبێت لە كاتی وەصلدا لە بەر إلتقاء اللساكنين .

نموونە :  بِهِمُ الْأسبابُ ، حينئذٍ ( أصله : حين إذْ + ـــًــ نْ = حينَ إذِنْ=حينئذٍ) ( يومئذٍ )

٤ ـ وەستان لەسەر ها  ی تأنيث . نموونە : رحمة ، شجرة ، القيامة

٥ ـ  (ها) ی ضمیر ( پێشی دەوترێت ها ی كنایە) ئەگەر پێشی كسرە یا خود یایێكی ساكن بێت ( مەد ، لین).

نموونە :  إلَيْهِ ، من ربِهِ ، بيدِهِ ، فيْهِ

٦ ـ  (ها) ی ضمیر ( پێشی دەوترێت ها ی كنایە) ئەگەر پێشی  ضمة یا خود واوێكی ساكن بێت ( مەد ، لین).

نموونە : قتلوْهُ ، فعلوْهُ ، رأَوْهُ ، خذوْهُ

بەلاَم (ها) ی ضمیر ئەگەر پێشی فەتحە بێت یا خود ئەلیف بێت یا خود پیتێکی ساکنی صحیح بێت واتە ساکنەکە حەرفی مەد نەبێت ئەوا إشمام و روم تیایدا ڕێپێدراوە .
نموونە : إنَّهُ ، لَهُ ، کتابَهُ ، علمتَهُ ، إجتباهُ ، هداهُ

## قورئان خوێن دەتوانێت بەدوو شێوە وشەی (تَأۡمَنَّا) بخوێنێتەوە

**یەکەم: الإشمام**

وەك دیارە وشەکە نونێکی شەددەداری تێدایە، کە پێکهاتوە لە دوو نون یەکێکیان سکوندارەو ئەوی دیکەیان فەتحەدارە، ئینجا لەکاتی خوێندنەوە، کە دەگەینە سەر نونە سکوندارەکە دەممان وەك ئەوە لێدەکەین کە بۆر (ضمة) دەخوێنینەوە، بەلاَم بەبێ دەنگ، ئەم دەم بەم شێوەیە لێکردنو مینگە درێژە دەبێت لەگەڵ نونە سکوندارەکەدا بکرێت تا نیشانی بدەین ئەم نونەی ئێستا سکوندارە لە بنەڕەتدا (ضمة) دار بووە .

**دووەم: الروم**

ئەم بارەی دووەم بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە (تأمَنُنَا) بەلاَم نونی یەکەم کە نونە مضمومەکەیە کەمێك بە پەلەو دەنگی نزمتر دەخوێنینەوە لە پیتەکانی دیکە.

## ٣ ـ الإمالة

لەزمانەوانیدا : إمالة ، أی : التحریك ، تحریك الشيء مائلا ، واتە : جووڵاندنی شتێك لە ڕێکیەوە بەرەو خوار بوونەوە .
لەزاراوەدا : پەیوەندی بە پیتی ألف و جووڵە ی فتحة هەیە ، بەوەی کە دەنگی پیتی ألف بخوێنیتەوە لەنێوان ألف و یا دا وە فەتحە بلێیت لە نێوان فتحة و کسرة دا ، بەم حاڵەتە دەوترێت الإمالة .
لەڕیوایەتی حفص عن عاصم دا یەك نموونەمان هەیە لە قورئاندا ، ئەویش لەسورەتی هود ئایەتی (٤١) ﴿ مَجۡرٜىٰهَا ﴾

# ٣ ـ التسهيل

**لەزمانەوانیدا : التسهیل ، أی : التخفیف ، التیسیر**

**لە زاراوەدا : پەیوەندی بە پیتی همزة هەیە ، کە بریتیە لە وتنی دەنگی همزه لە نێوان همزة و ألف دا .**

**دەکرێت بڵێین تسهیل حاڵەتی واجب ی هەیە و حاڵەتی جائز ی هەیە :**

**یەك حاڵەتی واجبمان هەیە لەڕیوایەتی حفص عن عاصم دا بۆ تسهیل لە سورەتی فصلت ئایەتی (٤٤)﴿ ءَاعْجَمِيٌّ ﴾**

**وە هەروەها حاڵەتی جائزیش بۆ تسهیل بریتیە لە وەجهی دووەمی خوێندەوەی مەدی فەرق کە تەنها ئەم سێ نموونەیەمان هەیە :**

﴿ءآلذَّكريْنِ﴾ ، ﴿ءآللهُ خيرٌ أمّا تشركون﴾ ﴿ءآلْئن﴾

## چۆنیەتی خوێندنەوەی (بئس الإسم الفسوق)

**لەم نموونەیەدا بابەتی التخلص من إلتقاء الساكنين ڕزگار بوون لە دووساکن لە یەك وشەداڕوودەدات کە بەم شێوەیەی لای خوارەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە**

**نموونەکە : ﴿ بِئۡسَ ٱلِاسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ ﴾الحجرات ( ١١ )**

- **دوو همزەی وەصل کۆبوونەتەوە الْــ اسْم**
- **دروست نیە دەستپێکردن بە اسْم چونکە همزەی وەصل ساکنە**
- **دەستپێدەکەین بە الْــ وە دەخوێندرێتەوە اَلْاسْم بەڵام قورسە لەسەر زمان دووساکن بەشوێن یەکتردا**
- **دەبینین دووساکن کۆبوونەتەوە ( لْ ، سْ) اَلْاسْم**
- **کەواتە ساکنی یەکەم دەکەین بە کسرە و دەیخوێنینەوە بە کسرە ی لامەکە (اَلِاسْم ) ، وە لەدەست پێکردندا دوو وەجهی هەیە وە یەکەمیان لەپێشترە**
  **أ. ( اَلِسْم) ب. (لِسْم)**
- **وە ئەگەر بئْسَ بگەیەنین بە الِاسم دەخوێنینەوە بئْسَ لِسْمُ الفسوقُ**

## چۆنیەتی خوێندنەوەی (نِعِمَّا)

لە بنەڕەتدا وشەکە بەم شێوەیەیە (نِعْمَ مَا) ، دواترمیمی یەکەم ساکنە کراوە بۆ تێهەڵکێشان (نِعْمْ مَا) ، ئینجا میمی یەکەم تێهەڵکێشی میمی دووەم کراوە بەم جۆرە دوو زەنندار هەیە (نِعْمَّا) یەکەمیان عین کەیە و دووەمیان میم ی ساکنە لە ناو میم مشددەکەدا ، لێرەدا هۆزە عەرەبییەکان بۆ دەربڕینی سێ ڕێگەیان هەیە:

أ ـ ژێردارکردنی پیتی عین بۆ ڕزگاربوون لە بەیەکگەیشتنی دوو زەنندار (نِعِمَّا)، بەم جۆرە لە ڕیوایەتی حفص دا دەخوێندرێتەوە .

ب ـ شاردنەوەی ژێرەی عەینو دەربڕین بە خێرا ( الإختلاس النطق بثلثي الحركة) (نِعِمّا)

ج ـ هێشتنەوەی عین بە زەنندارى لەگەڵ ئەوەی زەحمەتی تێدایە (نِعْمَّا)

## چۆنیەتی خوێندنەوەی (فَمَآ ءَاتَىٰنِۦ ٱللَّهُ)

ئەم وشەیە لە سورەتی (النمل٣٦)دا هاتووە دەتوانین کاتێك لەسەر وشەی (ءَاتَىٰنِۦ) وەستاین بێ (یا) بیخوێنینەوە، بەم جۆرە (فما ءاتانْ)، دەشتوانین بە (یا) بیخوێنینەوە بەم جۆرە (فَما ءَاتاني)، بەڵام ئەگەر لەسەری نەوەستاین دەبێت لەگەڵ (یا) بیخوێنینەوە بەم جۆرە (فَما ءاتانيَ اللهُ).

## چۆنیەتی خوێندنەوەی (نُـۨجِی ٱلْمُؤْمِنِینَ)

ئەم وشەیە لە سورەتی (الأنبياء: ٨٨)دا هاتووە، لە قورئاندا بە یەك نون نوسراوە بەڵام بە دوو نون دەخوێنرێتەوە، بەم جۆرە (نُنْجي).



# چۆنیەتی گەیاندنی سورەتی (الأنفال) بە (التوبة)

ئەگەرلەسەرەتادا دەست کرا بە خوێندنەوەی سورەتی (التوبة) ئەوە تەنها (إستعاذة) دەخوێندرێتو دەست دەکرێت بە خوێندنی سورەتەکە، بەڵام ئەگەر دوای تەواوکردنی سورەتی (الأنفال) ڕاستەوخۆ سورەتی (التوبة) بخوێندرێت ئەوە سێ شێوەی سەرەکی هەیە، کە لەم سێ شێوەسەرەکیە پانزدە حاڵەت دروست دەبێت بەم شێوەیە لای خوارەوە :

١ـ یەکەم شێوەی سەرەکی : ( الوقف) ڕاوەستان بە هەناسە لە نێوان هەردوو سورەت. لەم شێوەیەدا دەتوانیت بە حەوت حاڵەت بوەستی ، وە دواتر سەرەتای توبە بڵێیت.

٢ـ دووەم شێوەی سەرەکی : (السكتة)سەکتەیەك بە ئەندازەی دوو حەرەکە بەبێ هەناسە. لەم شێوەیەدا دەتوانیت بە حەوت حاڵەت سەکتە بکەیت و دواتر ڕاستەوخۆ سەرەتای توبە بڵێیت .

٣ـ سێیەم شێوەی سەرەکی : ( الوصل)گەیانی کۆتایی سورەتی (الأنفال) بە (التوبة) بەبێ سەکتەو هەناسە. بە حاڵەتی (الإقلاب) ، لەم شێوەیەدا دەتوانیت بە یەك حاڵەت خوێندنەوەکە بەردەوام بکەیت .



﴿ إنَّ اللهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيْمٌ * بَرَاءَةٌ ...﴾

## ڕوونكردنەوەى پانزدە حاڵەتەكەى چۆنيەتى گەياندنى سورەتى (الأنفال) بە (التوبة)

| جۆرى سەرەكى | حاڵەت | دوو جووڵە | چوار جووڵە | شەش جووڵە |
|---|---|---|---|---|
| ١.الوقف | السكون المحض تەنها ساكن كردن | عَلِيْــمْ * (...) | عَلِيْــمْ * (...) | عَلِيْــمْ * (...) |
| | الإشمام ( ساكن كردن + خڕكردنەوەى شفتان) | عَلِيْــمْ+إشمام * (...) | عَلِيْــمْ+إشمام * (...) | عَلِيْــمْ+إشمام * (...) |
| | الروم (وتنى يەك بەشى ضمة) | عَلِيْــمُ ثُلث الضمة * (...) | ........................ | ....................... |
| ٢.السكت | السكون المحض تەنها ساكن كردن | عَلِيْــمْ السكت* بَرَاءَة | عَلِيْــمْ السكت* بَرَاءَة | عَلِيْــمْ السكت* بَرَاءَة |
| | الإشمام ساكن كردن+ خڕكردنەوەى شفتان) | عَلِيْــمْ السكت +إشمام * بَرَاءَة | عَلِيْــمْ السكت +إشمام * بَرَاءَة | عَلِيْــمْ السكت +إشمام * بَرَاءَة |
| | الروم (وتنى يەك بەشى ضمة) | عَلِيْــمُ ثُلث الضمة + السكت * بَرَاءَة | ........................ | ........................ |
| ٣.الوصل | الإقلاب تطبيق أحكام النون الساكنة و التنوين | ........................ | ........................ | ........................ |

# چۆنیەتی وەقف وەستان لەسەر کۆتا پیتی وشە

١ ـ وشەیەك كۆتاییەكەی ضمة یا تنوینی ضمة بێت و پێشی مەد بێت ، بە حەوت حاڵەت دەوستێت:

نستعيْنُ (عليْمٌ) ← ١ . السكون المحض : ( ٢ )( ٤ )( ٦ ) جووڵە
٢ . الإشمام : ( ٢ )( ٤ )( ٦ ) جووڵە
٣ . الروم : ( ٢ ) جووڵە

٢ ـ وشەیەك كۆتاییەكەی كسرة یا تنوینی كسرة بێت و پێشی مەد بێت ، بە چوار حاڵەت دەوستێت :

الرحيْمِ (قديرٍ) ← ١ . السكون المحض : ( ٢ )( ٤ )( ٦ ) جووڵە
٢ . الروم : ( ٢ ) جووڵە

٣ ـ وشەیەك كۆتاییەكەی فتحة بێت و پێشی مەد بێت ، بە سێ حاڵەت دەوستێت :

ينفقونَ ← ١ . السكون المحض : ( ٢ )( ٤ )( ٦ ) جووڵە

٤ ـ وشەیەك كۆتاییەكەی ضمة یا تنوینی ضمة بێت و پێشی مەد نەبێت ، بە سێ حاڵەت دەوستێت:

الله الصمدُ : ١ . السكون المحض (الصمدْ) ٢ . الإشمام(الصمدْ + إشمام) ٣ . الروم(الصمدُ + ثلث الضمة)

٥ـ وشەیەك كۆتاییەكەی كسرة یا تنوینی كسرة بێت و پێشی مەد نەبێت ، بە دوو حاڵەت دەوستێت:

في العُقّدِ : ١ . السكون المحض (العقدْ) ٢ . الروم(الصمدِ + ثلث الكسرة)

٦ـ وشەیەك كۆتاییەكەی فتحة بێت و پێشی مەد نەبێت ، بە یەك حاڵەت دەوستێت:

إذا حَسَدَ : ١ . السكون المحض (إذا حسَدْ )

٧ ـ وشەیەك كۆتاییەكەی مەدی متصل بێت وەك ( السماءُ ، السماءِ ، السماءَ) ئەگەر هەمزەكە ضمة یا تنوینی ضمة ی هەبوو بە هەشت حاڵەت دەوەستێت ، ئەگەر هەمزەكە كسرة یا تنوینی كسرة ی هەبوو بە پێنج حاڵەت دەوەستێت ، ئەگەر هەمزەكە فتحە ی هەبوو بە سێ حاڵەت دەوستێت:

السمآءُ ← ١ . السكون المحض : ( ٤ )( ٥ )( ٦ ) جووڵە
٢ . الإشمام : ( ٤ )( ٥ )( ٦ ) جووڵە
٣ . الروم : ( ٤ ) ( ٥ )جووڵە

السمآءِ ← ١ . السكون المحض : ( ٤ )( ٥ )( ٦ ) جووڵە
٢. الروم : ( ٤ ) ( ٥ )جووڵە

السمآءَ ← ١ . السكون المحض : ( ٤ )( ٥ )( ٦ ) جووڵە

٨ ـ مەدی لازم : (فتحە) صوآفَّ: السكون المحض( ٦ ) جووڵە ، (كسرە)غيرمضآرٍّ: ١. السكون المحض( ٦ ) جووڵە ٢. الروم : ( ٦ )جووڵە ، (ضمة) ولاجآنٌّ : ١. السكون المحض( ٦ ) جووڵە ٢. الإشمام : ( ٦ )جووڵە ، ٣. الروم : ( ٦ )جووڵە

# چۆنیەتی خوێندنەوەی حەوت ئەلیفەکە لە قورئاندا

# (الألفات السبع في القرآن الكريم)

حەوت ئەلیف هەن لە قورئاندا لەکاتی وەستان لەسەریان دەخوێندرێنەوە، بەڵام لەکاتی ڕۆیشتن لەسەریان ناخوێندرێنەوە، ئەوانیش:

١ ـ ئەلیفی (أَنَـاْ) (ضمير المتكلم)

لە هەموو قورئاندا لەکاتی ڕۆیشتن لەسەری بە ( أَنَ) دەخوێندرێتەوە، بەڵام لەکاتی وەستان لەسەری بە (أَنَاْ) دەخوێندرێتەوە.﴿ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ﴾

٢ ـ ئەلیفی (لَّـٰكِنَّـاْ) لە سورەتی ﴿الكهف: ٣٨﴾ لەکاتی ڕۆیشتن بە (لكنَّ) دەخوێندرێتەوە و لەکاتی وەستان بە (لَّـٰكِنَّـاْ).﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴾

٣ ـ ئەلیفی (ٱلظُّنُونَاْ) لە سورەتی ﴿الأحزاب: ١٠﴾ ﴿ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾

٤ ـ ئەلیفی (ٱلرَّسُولَاْ) لە سورەتی ﴿الأحزاب: ٦٦﴾ ﴿ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾

٥ ـ ئەلیفی (ٱلسَّبِيلَاْ) لە سورەتی ﴿الأحزاب: ٦٧﴾ ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾

٦ ـ ئەلیفی (قَوارِيراْ) لە سورەتی ﴿الإنسان: ١٥﴾ ﴿ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ ﴾

بەڵام لەئایەتی (١٦) دا ﴿ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾ ئەگەر لەسەر وشەی (قَواريراْ) بوەستین یان نەوەستین ئەلیفەکەی ناخوێندرێتەوە، ئەگەر لەسەری بوەستین بە (قواريرْ) دەخوێندرێتەوە، واتە بە سکون لەسەر پیتی (را) وە پیتی(را) بە باریکی دەخوێندرێتەوە.

٧ ـ ئەلیفی (سَلَـٰسِلَاْ) لە سورەتی ﴿الإنسان: ٤﴾ تەنیا لەم وشەیەدا ئەگەر لەسەریشی وەستاین دەتوانین ئەلیفەکە نەخوێنینەوەو بڵێین (سلاسلْ).

﴿ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ ﴾

**تێبینی :**

**ئەلیفی (وَثَمُودَا۟) لە سورەتەکانی**

**١ ـ ﴿هود: ٦٨﴾** ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾﴾

**٢ ـ ﴿العنكبوت: ٣٨﴾** ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَـٰكِنِهِمْ ۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَعْمَـٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُوا۟ مُسْتَبْصِرِينَ ﴿٣٨﴾﴾

**٣ ـ ﴿الفرقان: ٣٨﴾** ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَـٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾﴾

**٤ ـ ﴿النجم: ٥١﴾** ﴿وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾﴾

**بە نوسین دەنوسرێت، بەڵام نە لەکاتی وەستان لەسەری‌و نە لەکاتی ڕۆیشتن لەسەری ناخوێند رێتەوە.**

# گەورەکردنو باریك کردن
# التفخيم و الترقيق

**له زمانەوانیدا : التفخيم ، واتە گەورەکردن.**

**له زاراوەدا : التفخيم ، گەورەکردنێکە بەسەر پیتدا دێت .**

**پیتەکانی زمانی عەرەبی لەڕووی گەورەکردنو بچوككردنەوە دەکرێن بە سێ بەشەوە:**

**أ ـ ئەو پیتانەی هەمیشە بە گەورەیی دەخوێندرێنەوە.**

**ب ـ ئەو پیتانەی هەمیشە بە بچووکی دەخوێندرێنەوە.**

**ج ـ ئەو پیتانەی هەندێك جار بەگەورەییو هەندێك جاریش بە بچووکی دەخوێندرێنەوە.**

## أ ـ ئەو پیتانەی هەمیشە بە گەورەیی دەخوێندرێنەوە.

**بریتین لە حەوت پیتەکەی (إستعلاء) (خص ضغط قظ) وە ئەم گەورە کردنەش چوار ئاستی هەیە :**

**١ ـ یەکەم پلە و بەرزترین حاڵەتی تفخیم لە پیتەکانی إستعلاء لەوکاتەدا دەبێت کە پیتەکە فەتحەی هەبێتو پیتی ئەلیفیشی بەدوادا بێت، وەك: (قَالوا، خَالدينَ، للطَّائفين، الغَائبين).**

**٢ ـ دووەم پلە ئەگەر پیتی (إستعلاء) فەتحەی هەبێت بەڵام ئەلیفی بەدوادا نەهات بێت، ئەمە کەمتر لەوەی یەکەم گەورە دەکرێت، وەك: (ضَرَبَ، طَبَعَ، دَخَلوا)**

**٣ ـ سێیەم پلە ئەگەر پیتی (إستعلاء) بۆری هەبێت، وەك: (ضُربَ، طُوبي، قُولوا)**

**٤ ـ چوارەم پلە ئەگەر پیتە (استعلاء)ەکە کەسرەی هەبێت، کە ئەمە نزمترین پلەی قەڵەو کردنە، وەك: (دُخِلَتْ، قِسْمَةٌ ضِيزَى)**

**بەڵام ئەگەر پیتە (إستعلاء)ـەکە ساکن بێت ، ئەوە گەورەکردنەکەی بەجۆری حەرەکەی پیتی پێشی دەبێت، وەك: (مَطْلَع) ئەوە گەورەکردنی پیتی (ط) وەك خاڵی دووەم دەبێت، (مُقْمَحُونَ) ئەوە گەورەکردنی پیتی (ق) وەکو خاڵی سێیەم دەبێتو (إِخْراج) گەورەکردنی پیتی (خ) وەك خاڵی چوارەم دەبێت.**

## ب ـ ئەو پیتانەی هەمیشە بە بچووکی دەخوێندرێنەوە

بریتین لە پیتەکانی (الإستفال) جگە لە پیتی (را) و (لام)ی وشەی (الله)و پیتی (الألِف) واتە (ء، ب، ت، ث، ج، ح، د، ذ، ز، س، ش، ع، ف، ك، م، ن، ه، و، ي)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾
لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ
فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾

## ج ـ ئەو پیتانەی هەندێك جار بەگەورەییو هەندێك جاریش بە بچووکی دەخوێندرێنەوە.

ئەو پیتانەی هەندێك جار بە گەورەییو هەندێك جار بە باریکی دەخوێنرێنەوە، بریتین لە :

١ ـ پیتی (ل ـ لام ـ)لامی وشەی پیرۆزی (الله)

تێبینی : پیتی لامی وشەی پیرۆزی (الله) لە یاساکانی لام باسکراوە.

٢ ـ پیتی ( ر ـ را ـ)

پیتی (را) لە یاساکانی (أحكام الراء) باس کراوە.

٣ ـ پیتی ( ا ـ ألف ـ )

پیتی (الألف) گەورە دەکرێت لە سێ شوێندا:

أ ـ ئەگەر لەدوای پیتی (إستعلاء) ــەوە هات، (الضآلين).

ب ـ لەدوای پیتی لامی (الله) پیتی ألف گەورە دەکرێت بەمەرجێك لامی وشەی پیرۆزی (الله) مفخم بێت .

ج ـ ألف گەورە دەکرێت کاتێك لەدوای (را) ی مفخم هات، وەك (ولو ترَى)

جگە لەم شوێنانەی باسمان کرد، وە هەروەها کاتێك بەدوایدا پیتێکی باریك هات، لە هەموو شوێنەکانی دیکەدا پیتی ألف بە باریکیو سادەیی دەخوێندرێتەوە.

٤. مینگەی (الغنة) لە حاڵەتی الإخفاء ، نونی ساكن و تەنوین كە دەگەن بە پێنج پیتی إستعلاء (ص ، ض ، ط ، ظ ، ق)

مینگە (الغنه)گەورە دەكرێت كاتێك كە نونی ساكن یا تەنوین (إخفاء) دەكرێن‌و پێنج پیت لە پیتەكانی (إستعلاء) یان بەدوادا دێت.

| پیتی إستعلاء | نموونەی (نْ) لە یەك وشەدا | نموونەی (نْ) لە دوو وشەدا | نموونەی تەنوین |
|---|---|---|---|
| ص | يَنْصَرُون | من صِيَامٍ | وَنَخيلٌ صِنْوَانٌ |
| ض | مَّنضُودً | من ضَعْفٍ | مسْفِرَةٌ ضَاحِكَةٌ |
| ط | يَنطِقُونَ | مِن طِين | مُبَـٰرَكَةً طَيِّبَةً |
| ظ | يَنظُرُونَ | مَن ظَلَمَ | ظِلاًّ ظَلِيلاً |
| ق | يَنقَلِبُونَ | أَن قَالُواْ | كُلَّ شَىْءٍ قُبُلاً |

مینگە بێجگە لەوەی كەلەم خشتەیەی سەرەوەدا باسمان كرد لە حاڵەتەكانی تردا بە لاوازو باریك‌و بچووك دەخوێندرێتەوە.

# جۆرەکانی إدغام

# تێهەڵکێشانی هاو وێنە (إدغام المتماثلين)

**بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیت، کە لە سیفەتو جێگە دەرچوون (مخرج) وەك یەکن و یەکەمیان سکوندارە، لەم کاتەدا پیتی یەکەم دەغم دەکرێت لەگەڵ پیتی دووەم و دەبنە یەك پیتی شەددەدار، یان بریتییە لە تێهەڵکێش کردنی دوو پیتی وەکو یەك کاتێك بەدوای یەکدا دێن، بەمەرجێك یەکەم ساکن و دووەم متحرك بێت و وەکو یەك پیتی شەددەداری لێدێت.**

| شێوازی نووسین | شێوازی خوێندنەوە |
|---|---|
| فَمَا رَبِحَتْ تِّـجَـٰرَتُهُمْ | فَمَا رَبِحَــتِّــجَـٰرَتُهُمْ |
| طَلَعَت تَّــزَٰوَرُ | طَلَعَـــتـَّــزَٰوَر |
| وَقَدْ دَّخَلُوا | وَقَــدَّخَلُوا |
| إِذْ ذَّهَبَ | إِذَّهَبَ |
| يُدْرِكْـكُّــمُ | يُدرِكُّـــم |
| قُلْ لَّآ أَقُولُ | قُلاَّ أَقُولُ |

**تێبینی بۆ زانیای زیاتر:**

**١ ـ لە وتەی خودا ﴿مَالِيهْ* هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيهْ﴾ لە سورەتی (الحَاقَّة)، دەتوانین های (ماليهْ) دەغم بکەین لەگەڵ (های) (هلك)و دەشتوانین دەغمیان نەکەین، ئەگەر دەغممان نەکردن ئەوکات کەمێك بێ نەفەس خواردنەوە لەسەر مالیە دەوەستین و ئینجا بەردەوام دەبین لەسەر خوێندنەوە، واتە دەتوانین بە سەکتە یان وقف یان دەغم بیخوێنینەوە.**

**٢ ـ نابێت واوی مەدی ئەگەر واوی متحرکی لە دوادا هات یان یائی مەدی ئەگەر یائی متحرکی لەدوادا هات دەغم بکرێن، چونکە مەخرەجیان وەك یەك نییە.**

**نموونە : ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ ﴿الَّذِي يُوَسوِسُ﴾**

**٣ ـ لە پیتەکانی (ن، م)دا مینگە دروست دەبێت. نموونە : ﴿وَمِنْهُم مَّن﴾ ﴿ وَلَن نُّشْرِكَ﴾**

# تێهەڵکێشانی هاو ڕەگەز (إدغام المتجانسين)

**ئەم جۆرە دەغمە بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیت، کە یەك شوێن دەرچونیان هەیە، بەڵام لە سیفەتدا جیاوازن‌و یەکەمیان ساکنە، ئەو کاتە پیتی یەکەم دەغم دەکرێت لەگەڵ پیتی دووەم‌و دەکرێنە یەك پیتی شەددەدار لە جۆری پیتی دووەم، ئەم جۆرە دەغمەش لە بەیەك گەیشتنی ئەم پیتانەدا ڕوو دەدات ئینجا لە یەك ووشەدا بێت یان دوو وشە :**

| ژمارە | دوو پیتی إدغامی متجانسین | شێوازی نووووسین | شێوازی خوێندنەوە |
|---|---|---|---|
| ١ | (ت ، ط)<br>تێبینی : لە هەر شوێنێکی قورئاندا هات إدغامی متجانسەینە | وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ<br>وَدَّت طَّآئِفَةٌ<br>فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ | وَكَفَرَ طَّآئِفَةٌ<br>وَدَّطَّآئِفَةٌ<br>وَكَفَرَ طَّآئِفَةٌ |
| ٢ | (ط ، ت)<br>تێبینی : پیتی ( ط ) مخرجی دەڕوات بەڵام سیفەتی إطباقي دەمێنی کەواتە ئەمەإدغامێکی ناقصە، تەنها ئەم چوار وشەیە هەیە لە قورئاندا | لَئِنْ بَسَطتَ<br>أَحَطتُ<br>فَرَّطْتُم<br>فَرَّطْتُ | لَئِنْ بَسَتَ<br>أَحتُّ<br>فرَّ تُّـم<br>فرَّتُّ |
| ٣ | (ت ،د)تێبینی : تەنها ئەم دوو وشەیە هەیە لە قورئاندا | أَثقَلَت دَّعَوَا<br>أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا | أَثقَلَدَّعَوَا<br>أُجِيبَدَّعْوَتُكُمَا |
| ٤ | (د ،ت) تێبینی : لە هەر شوێنێکی قورئاندا هات إدغامی متجانسەینە | قَد تَّبَيَّنَ<br>عَقَدتُّم | قَـتَّـبَيَنَ<br>عَقَّتُّم |
| ٥ | (ث ، ذ)تێبینی : تەنها ئەم یەك وشەیە هەیە لە قورئاندا | يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ | يَلْهَذّٰلِكَ |
| ٦ | (ذ ، ظ)تێبینی : تەنها ئەم دوو وشەیە هەیە لە قورئاندا | إِذ ظَّلَمُوٓاْ<br>إِذ ظَّلَمْتُمْ | إِظَّلَمُوٓاْ<br>إِظَّلَمتُم |
| ٧ | ( ب ،م) تێبینی : تەنها ئەم یەك وشەیە هەیە لە قورئاندا | يابنيَّ ٱرْكَب مَّعَنَا | يابنيَّ ٱرْكَـمَّـعَنَا |

# تێهەڵکێشانی لێك نزیك (إدغام المتقاربین)

**بریتییە لە بەیەك گەیشتنی دوو پیت، کە جێگە دەرچوونو سیفەتیان لێك نزیکەو پیتی یەکەمیان ساکنە ، ئەوکاتە پیتی یەکەم دەغم دەکرێت لەگەڵ پیتی دووەمو دەکرێنە یەك پیتی شەددەدار لەجۆری پیتی دووەم، ئەم دەغمەش لە چوار شوێندا ڕوو دەدات:**

| ژمارە | دوو پیتی إدغامی متقاربین | شێوازی نووسین | شێوازی خوێندنەوە |
|---|---|---|---|
| ١ | (ل ، ر) | وَقُلْ رَّبِّ | وَقُــرَّ بِ |
| ٢ | (ق، ك) | أَلَمْ نَخْلُقكُّمْ | أَلَمْ نَخلُـكَّـمْ |
| ٣ | لامی تعریف (الـ) لە چواردەپیتی شەمسیدا<br>طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحِماً تَفُزْ ضِفْ ذا نِعَم<br>دَعْ سُوءَ ظَنٍّ زُرْ شَرِيفاً للكرم | والشَّمسِ | وَشَّمسِ |
| ٤ | (النون الساكة و التنوين + ي ر م ل و ) | مِنْ مَّارِجِ<br>مِن وَلي<br>مِنْ لَّدنه<br>مِنْ رَّبِهِم<br>مَنْ يَقُوْلُ | مِمَّارِجِ<br>مِوَّلي<br>مِلَّدُنه<br>مِرَّبِّهِم<br>مَيَّقول |

# النَّبْرُ

تعريفه : هو الضّغط على مقطع أو حرف معين من حروف الكلمة بحيث يكون صوته أعلى بقليل مما يجاوره.

**بريتيه له فشار درووست كردن له سەر برِگەیەك یاخود پیتێكی دیاری كراو له وشەیەكدا به شێوازێك كه دەنگی ئەو پیته ی كه فشاری خراوەته سەر ئەندزێك لەوە ی پەنای زیاتر بێت.**

## مواضع النبر فی القرءان الكريم

## شوێنەكانی نەبر له قورئاندا

١. عند الوقف على الحرف المشدد : **واته : كاتی وەستان لەسەر پیتی شەدەدار**

**نموونه :** (الْحَــيُّ)-(مُسْتَقِرٌّ)-(وَبَثَّ)

السبب :وذلك لأن الحرف المشدد عبارة عن حرفين أحدهما ساكن والآخر متحرك ، وعندما نقف على الحرف المشدد فإننا نقف على الحرف الساكن فقط وكأنه سقط من التلاوة حرف ولذلك فإننا نعوِّض عن هذا الحرف بالضغط على الحرف الساكن.

ويستثنى من ذلك الحالات الآتية . **واته : جگه لەم حاڵەتانەی لای خوارەوە :**

أ . النون و الميم المشددتين لما فيهما من غنّة. ( نَّ)( مَّ)

ب . الحرف المقلقل. (قطب جد)

٢.عند نطق الحرف المشدد المسبوق بحرف مد . **واته : له مەدی لازمی مثقلی كلمی دا . نموونه :** (الضَّآلِّينَ)-(دَآبَّةٍ)-(الْحَآقَّةُ)

السبب : وذلك لأن انشغال اللسان بنطق المد الطويل قد يؤدى إلى نطق الحرف المشدد كأنه حرف واحد و بذلك يسقط من التلاوة حرف.

٣. عند نطق الواو و الياء المشددتين . **واته : كاتی خوێندنەوەی(واو) و( یا) ی شەدەدار . نموونه :** (الْقُوَّةِ)-(قَوَّامِينَ)-(شَرْقِيًّا)-(صَبِيًّــاً) السبب : وذلك خشية المد

٤.الوقف على كلمة آخرها همزة قبلها حرف مد ولين .واته : وەستان لەسەر وشەیەك كە كۆتاییەكەی همزە بێت و پێش همزەكە حەرفی مەد یا لین بێت .

نموونە : (السَّمَاءِ) - (السُّوءَ) - (شَّيْءٍ)

٥. الحرف السابق لحرف مد ، لەم حاڵەتەدا لە قورئاندا تەنها ئەم سێ نموونەیەمان هەیە ئەوەش بریتیە لە نەبرکردن لە سەر پیتی پێش حەرفی مەد تا مانای مثنی نە بێت بە مفرد .

نموونە : (فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ) - (قَالَا الْحَمْدُ لِلَّهِ ) - (وَاسْتَبَقَا الْبَابَ)

والضغط فى هذه الحالة يكون على الحرف السابق للألف المدية التى تسقط وصلاً للتخلص من التقاء الساكنين ويؤتى بالنبر هنا حتى لا يلتبس المثنّى بالمفرد



# همزة القطع(الأصلي) و همزة الوصل

هەمزەی قطع (أصلی) چی یە؟

ئەو هەمزەیەیە لە وشەدا ئەگەر لێی بپچڕێنیت کاریگەری لەسەر وشەکە دەبێت، وەك ناوی (أحمد) ئەگەر هەمزەکەی لابەریت دەبێت بە (حمد) مانای وشەکە دەگۆڕێت، ئینجا هەمزەی قطع لە سەرەتای وشەدا بوو یان کەوتە ناوەندەکان یان لەسەری وەستاین حذف ناکرێتو دەبێت بخوێندرێتەوە:

نموونەی همزەی قطع لە ناو و فیعل و پیت دا هەیە :

١ـ الإسم : ﴿ أزواجٌ مطهرةٌ﴾﴿من بعدي اسمه أحمد﴾

٢ـ الفعل :﴿ أَنْبِئْهُمْ بِـــأسمائهم﴾﴿ فأراد﴾﴿ يؤْمنون﴾﴿ يشاء﴾

٣ـ الحرف : ﴿ إنَّ الله يأمركم﴾ ﴿ إنَّ إلياس﴾

هەمزەی وصل چی یە؟

ئەو هەمزەیەیە ئەگەر لە سەرەتاوە دەستت پێکرد دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ وشەیەك لێکماندا هەمزەکە نامێنێت وە لە خوێندنەوەدا حذف دەکرێت ، نیشانەکەشی لە مصحفدا ( ﺻ ) صادێکی بچووکە لەسەر ئەلیفەکە کراوە.

نموونەی همزەی وصل لە ناو و فیعل و پیت دا هەیە :

أ ـ ( في الحرف ) هەمزەی وصل لە پیت دا:

تەنها دەچێتە سەر ( الـــ )ی ناساندن (تعریف) کە ئەگەر لە سەرەتای خوێندنەوە بووین دەخوێندرتەوە و هەمیشە فەتحەی دەبێت، بەڵام ئەگەر هەمزەکە لەگەڵ وشەیەك لێك درابوو ناخوێندرێتەوە، وەك :

(الْحَاقة (ئە لْ حاقة) همزەخوێندرایەوە)

( مَا الْحَاقَّةُ (مە لْ حاقة) همزە نەخوێندرایەوە)

ب. ( في الإسم)هەمزەی وصل لە اسم دا،

**ئەگەر هەمزەی وصل کەوتە سەرەتای خوێندنەوە لە إسم دا هەمیشە کەسرەی دەدەینێ وەك ئەم نموونانەی لای خوارەوە :**

| ژمارە | الإسم | هەمزە ی وصل لەسەرەتادا دەخوێندرێتەوە | هەمزە ی وصل لە ناوەند دا ناخوێندرێتەوە |
|---|---|---|---|
| ١ | إبْن | إبْنُ مَرْيَمَ | عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ |
| ٢ | إبنت | إبْنَتَ عِمْرَٰنَ | وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ |
| ٣ | إمْرُؤٌ | إمْرُؤٌاْ هَلَكَ | إنِ ٱمْرُؤٌاْ هَلَكَ |
| ٤ | إمْرَأَةٌ<br>إمْرَأَت | إمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا<br>إمْرَأَتَـيْنِ تَذُودانِ | وَ إنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا<br>وَ وَجَدَ مِنْ دُونِهِمَا ٱمْرَأَتَـيْنِ تَذُودانِ |
| ٥ | إثْنَيْنِ<br>إثْنَانِ | إثْنَيْنِ<br>إثْنَانِ | لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَـٰهَيْنِ ٱثْنَيْنِ<br>حِيْنَ الوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ |
| ٦ | إثْنَتَينِ | إثْنَتَيْنِ<br>إثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا | فإنْ كانَتَا ٱثْنَتَيْنِ<br>فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا |
| ٧ | إسمٌ | إسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ | مِنْ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ |
| ٨ | مصدرالفعل الماضي الخماسي | إبتِغاء ، إفترآء ، إختلاف | ﴿... نفسَهُ ٱبتِغاَء﴾ |
| ٩ | مصدرالفعل الماضي السداسي | إستكباراً ، إستغفار | ﴿... و ٱستكبروا ٱستكباراً﴾ |

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**لە وشەی (ٱمرُؤٌ) حەرەکەی پیتی (را)یەکە وەکو حەرەکەی ئەو پیتە دەبێت کە لەدوای دێت، خۆ ئەگەر بە ئەو دەستمان پێکرد واتە لە (ٱمرؤ) دەستمان بە خوێندنەوە کرد ئەوا هەمزەکەی ژێردار دەکرێت. ﴿ٱمرَأَ سَوْءٍ﴾ ﴿إِنِ ٱمْرُؤٌا هلك﴾ ﴿لِكُلِّ ٱمرِيءٍ منهم﴾**

**ب ـ ( في الفعل )هەمزەی وصل لە فعل دا:**

**بەو جۆرەی باسکرا ئەگەر بە هەمزەکە دەستمان بە خوێندنەوە کرد دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر لەگەڵ وشەیەك لێکماندا ئەوا هەمزەکە نامێنێتو حذف دەکرێت، بەڵام حەرەکەی هەمزەکە بەپێی فیعلەکە دەگۆڕێت:**

| ژمارە | الفعل | نموونەی هەمزە ی وصل لەناوەندا ناخوێندرێتەوە | نموونەی هەمزە ی وصل لەسەرەتادا دەخوێندرێتەوە | جۆری حەرەکەی هەمزەکە<br>ئەگەر سێیەم پیت ضمة بوو ئەوا همزەی وصل ضمة ی بۆ دادەنێین ، بەڵام ئەگەر سێیەم پیت فتحە یا کسرەی هەبوو ئەوا همزەی وەصل کسرەی بۆ دادەنێین |
|---|---|---|---|---|
| ١ | الفعل الماضي الخماسي | وٱنطَلَقَ<br>وٱنقَلَبوا | إنطَلَقَ<br>إنقَلَبوا | کسره ، چونکە سێەم پیتی فتحەی هەیە |
| ٢ | الفعل الماضي السداسي | وٱستكبروا<br>وٱستغفر | إستَكبروا<br>إستَغفر | کسره، چونکە سێەم پیتی فتحەی هەیە |
| ٣ | الأمرمن الفعل الماضي الخماسي | ٱنطلقوا<br>ٱنتَهَوْا | إنطَـلِقوا<br>إنتَهَوْا | کسره، چونکە سێەم پیتی فتحەی هەیە |
| ٤ | الأمرمن الفعل الماضي السداسي | وٱستغفِرْ<br>ٱستئجِرْه | إستَغفِرْ<br>إستَئجِرْه | کسره، چونکە سێەم پیتی فتحەی هەیە |
| ٥ | الأمرمن الفعل الماضي الثلاثي | و ٱنْظُرْ<br>و ٱخْرُجْ<br>و ٱضْرِبْ | أُنْظُرْ<br>أُخْرُجْ<br>إِضْرِبْ | ضمة، چونکە سێەم پیتی ضمةی هەیە<br>ضمة، چونکە سێەم پیتی ضمةی هەیە<br>کسره، چونکە سێەم پیتی کسرەی هەیە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**بەڵام لەم وشانەدا کە پیتی سێیەمی بۆرێکی تووشهاتوە (عارض) ـە ، هەمزەکە بە ژێرداری دەخوێندرێتەوە، لەبەرئەوەی بۆر (الضمة)ی پیتی سێیەمەکە تووشی هاتوە بەهۆی واوی جماعەوە دەنا خۆی لە بنەڕەتدا بۆر نییە.**

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ضمة ی پیتی سێم عارضة واتە أصلی نیە | ٱمْشُواْ | ٱئْتُواْ | ٱئْتُونِى | ٱبْنُواْ | ٱمْضُوا | ٱقْضُوٓاْ |
| چۆنیەتی خوێندنەوەوی همزەی وەصل لەم وشانەدا لە سەرەتادا | إِمْشُواْ | إِيْتُواْ | إِيْتُونِى | إِبْنُواْ | إِمْضُوا | إِقْضُوٓاْ |

# الوقف و الإبتداء
# وەستان و دەستپێکردن بە خوێندنەوەی قورئان

بریتییە لە بوونی زانیاری لەسەر چەند بنچینەو بناغەیەك بەهۆیەوە شوێنە دروستو نادروستەکانی وەستانو دەستپێکردنەوە لە قورئان خوێندن دەزانرێت. سودەکەشی پاراستنی دەقی قورئانە لەوەی وشەیەك بدرێتە پاڵ ڕستەیەك کە هی خۆی نەبێت.

**أ ـ الوقف (وەستان)**

پچڕاندنی دەنگ یان بێ دەنگ بوونە لەسەر وشەیەکی قورئان بۆ ماوەیەك، بەشێوەیەکی ئاسایی هەناسەی لەگەڵدا دەبێت بەمەبەستی بەردەوام بوون لەسەر خوێندنەوەکە.

**ب ـ القطع ( بچڕاندن)**

پچڕاندنی دەنگە لەسەر وشەیەکی قورئان بەمەبەستی کۆتایی هێنان بە خوێندنەوە، شوێنەکەشی سەری ئایەتەکانە.

## جۆرەکانی ( وقف )

الوقف (وەستان) دەبێتە سێ بەش:

**١ ـ (الوقف الإضطراري) وەستانی ناچاری.**

ئەم وەستانە کاتێك ڕوو دەدات کە قورئان خوێن نەفەسی نامێنێت یان کۆکە یان پژمین یان گریانی بۆ دێت، یان هەر شتێك کە ناچاری بکات ڕابوەستێت. ئەم جۆرە وەستانە جائزە، ئەگەر وەستانەکە لە شوێنێك بوو کە وەستانی جائز نەبوو لەکاتی دەستکردنەوە بە خوێندنەوە کەمێك دەگەڕێتەوە بۆ دواوە هێندەی ئەوەی ماناکەی پێویستیەتی. (واتە هێندەی ئەوەی مانای وشەکە داوای دەکات).

**٢ ـ (الوقف الإختباري) وەستانی تاقیکردنەوە.**

ئەم جۆرە وەستانە بۆ کاتی فێربوونی قورئان خوێندن، یان تەفسیرکردنی ئایەتو وشەکانە، ئەم جۆرە وەستانەش جائزە لەسەر هەر وشەیەك بێت.

٣ ـ (الوقف الإختياري) وەستانی خۆویست.

بە وەستانێك دەوترێت كە خوێنەر بە ویستی خۆی لەسەر وشەیەك بوەستێت، واتە لەبەر ئەو دوو حاڵەتەی پێشوو نەبێت، ئەم جۆرە وەستانەش دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش:

أ ـ (الوقف التام) وەستانی تەواو

ب ـ (الوقف الكافي) وەستانی كفایەت

ج ـ (الوقف الحسن) وەستانی باش

د ـ (الوقف القبيح) وەستانی ناشیرین

هـ ـ(الأقبح من قبيح) وەستانی زۆر ناشیرین

ئێستە دێینە سەر باسی هەریەك لەم پێنج وەستانە لە جۆری (الوقف الإختيارى) :

أ ـ (الوقف التام) وەستانی تەواو

بریتییە لە وەستان لەسەر كۆتایی ئایەتەكان، یان چیرۆكێك، كە ماناكەی لەوێدا تەواو دەبێتو بەهیچ جۆرێك پەیوەندی نەبێت لە نێوان پێشو دوای وەستانەكە، چ لەبارەی ماناوە چ لەڕووی ڕێزمانیەوە. ئەم وەستانە جوانە لەسەری بوەستیت ئینجا دەست بكەینەوە بە خوێندنەوە، وەك ئەم چوار شوێنە لە سەرەتاكانی سورەتی البقره ، یان وەستان لەسەر ، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾

﴿هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (البقره: ٥) لێرەدا باس لە بڕواداران تەواو دەبێت.

﴿ولَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (البقره: ٧) ئەمە باسی كافرانەو ئەوەی بەدوایدا دێت باسی مونافیقەكانە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقره: ٢٠) ئەوەی بەدوایدا دێت باسێكی ترە.

﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (البقره: ٢٩) ئایەتی دواتر باسێكی دیكەیە.

ب ـ (الوقف الكافي) وەستانی كفایەت

ئەم وەستانەش جائزەو بریتییە لە وەستان لەسەر وشەیەك كە تا ئەو شوێنە ماناكەی تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی لەدوایەوە دێت بەمانا پەیوەندی پێوەی هەبێت نەك بە وشە (معنى لا لفظا)، واتە لەسەر هەمان بابەت دەڕوات كە پێشتر باسكراوە، وەك وەستان لەسەر لەم شوێنانە لە سورەتی البقره.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ (البقره: ٦)
﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ﴾ (البقره: ٨)
﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ﴾ (البقره: ١٠)
﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ﴾ (البقره: ١٢)

### ج ـ (الوقف الحسن) وەستانی باش

ئەم وەستانەش دروستە، بریتییە لە وەستان لەسەر وشەیەك كە واتا بەخشە، بەڵام باشترە بیگەیەنیت بەدوای خۆی چونكە ئەوەی دوای خۆی هەم بە واتا هەم لە ڕووی زمانەوانییەوە پەیوەندی پێوەی هەیە، ڕاستە بەشی یەكەم واتا بەخشەو ئاساییە لەسەری بوەستیت بەڵام بەشی دووەمی جوان نییە لەوێوە دەست بەخوێندنەوە بكەین بێ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ شوێنێك لە پێشەوە كە دروستە لەوێوە دەست پێ بكەینەوە، وەك وەستان لەسەر (الحمد الله) لە (الحمد الله رب العالمین)، ڕاستە وەستان لەسەر (الحمدالله) باش‌و دروستە بەڵام باشتر وایە بیگەیەنین بە (رب العالمین) چونكە ئەگەر لەسەر (الحمدالله) وەستاین كە دەستمان كردەوە بە خوێندنەوە نابێت لە (رب العالمین)ەوە دەست پێبكەینەوە بەڵكو دەبێت (الحمد الله) دووبارە بكەینەوە.

### د ـ (الوقف القبیح) وەستانی ناشیرین

بریتییە لە وەستان لەسەر وشەیەك كە مانایەكی ئەوتۆ نەبەخشێت‌و پەیوەندیشی لەگەڵ وشەكانی دوای خۆی هەبێت لەڕووی ماناو زمانەوانیشەوە، وەكو وەستان لەسەر (مبتداء) بەبێ (خبر)، یان وەستان لەسەر (فعل) بەبێ (فاعل)، یان وەستان لەسەر (فاعل) بێ (مفعول به)، یان لەسەر (شرط) بەبێ وەڵامەكەی یان وەستان لەسەر (حروف مشبة بالفعل) وەك (إنَّ، لكنَّ) بەبێ (اسم و خبر) یان وەستان لەسەر (فعل ناقص) وەك (كان، لیس) بەبێ (اسم و خبر)، یان هەر جۆرێكی دیكە. نموونە :

ـــ وەستان لەسەر (قال) لە (قال الله) قالَ: فعل ماضي، الله: لفظ الجلالة فاعل.
ـــ وەستان لەسەر (محمد) لە (محمد رسول الله) محمد: مبتدأ، رسول الله: خبر.
ـــ وەستان لەسەر (وكان ) لە (وكان الله) كان: فعل ماضي ناقص، الله: لفظ جلالة إسم كان.

### هـ ـ (الأقبح من قبيح) وەستانی زۆر ناشیرین

**ئەم وەستانە حەرامەو تەنها ئەگەر لەبەر ناچاری وەستایت، خۆ ئەگەر کەسێك بڕوای وابێت ئاساییە ئەوە کافر دەبێت، بەڵام جائزە لەسەر کۆتایی ئایەت بوەستیت لە وەستانی زۆر ناشیرین بەمەرجێك بەردەوام بیت لەسەر خوێندنەوە، وەك لە (فويل للمصلين) بوەستیت ئینجا بەردەوام بیت لەسەر خوێندنەوەکە.**

**نموونە :**

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِ ي﴾ (البقرة)

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً﴾

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ (النساء)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾

﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ وَٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الإنسان)

﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ٣١﴾

﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ وَٱلظَّٰلِمُونَ﴾ (الشورى)

﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى
رَحْمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ٨﴾

﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ﴾ (آل عمران)

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ
سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ
ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ١٨١﴾

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**١ ـ له قورئاندا هیچ وەستانێك واجب نییه، كه ئەگەر قورئان خوێن نەوەستا گوناهبار بێت، یان حەرام بێت ئەگەر وەستا پێی گوناهبار بێت، تەنها ئەگەر هۆیەكی هەبێت، بەم هۆیەوه حەرام بێت وەك به ئەنقەست وەستان لەسەر (ما من إله)، خۆ ئەگەر ماناكەی مەبەست بوو پێی كافر دەبێت.**

**٢ ـ هەرچەنده خوێنەری قورئان شارەزای ڕێزمانو فەرهەنگی زمانی عەرەبی بێت زیاتر دەتوانێت شارەزای خوێندنو تەجویدی قورئان بێت.**

# الإبتداء (دەست پێکردن)

چۆن لەکاتێکدا دەوەستین پێویستە لە شوێنێکی گونجاودا بوەستین، ئاواش بۆ دەست کردن بە قورئان خوێندن پێویستە لە شوێنێکی گونجاوەوە دەست پێبکەین.

## جۆرەکانی الإبتداء (دەست پێکردن)

الإبتداء (دەستپێکردن) دەبێتە دوو بەش:

بەشی یەکەم : (الإبتداء الجائز) دەستپێکردنی دروست ، کە ئەمیش دەبێتە دووبەش :

١ ـ (الإبتداء التام) دەستپێکردنی تەواو

ئەم جۆرە دەست پێکردنە بە بەشێك کە نە لەرووی مانا نە لەرووی زمانەوانییەوە پەیوەندی نییە بەوەی پێش خۆیەوە، وەك :

ـــ دەستپێکردن بە سەرەتای سورەتەکان .

ـــ یان بە سەرەتای چیرۆکەکان (كذبت ثمودُ المرسلين)

ـــ یان یەکەم باسی بەهەشت یان دۆزەخ

ـــ یان باسی سیفاتی ئیمانداران یان مونافیقەکان.

٢ ـ (الإبتداء الكافي) دەستپێکردنی کیفایەت

ئەمەش دەستپێکردنە بە وشەیەکی قورئان کە لە ڕووی ماناوە (معنی) پەیوەندی بە پێش خۆیەوە هەیەو لەڕووی زمانەوانیەوە (لفظا ، إعراب ) پەیوەندی پێوەی نییە، وەك دەست پێکردن بە :

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ لە سورەتی (البقرە)

﴿يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ لە سورەتی (البقرە)

﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ﴾ لە سورەتی (البقرە)

﴿أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَـٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ﴾ لە سورەتی (البقرە)

**بەشی دووەم : (الإبتداء الممنوع) دەستپێکردنی قەدەغە ، کە ئەمیش دەبێتە دووبەش :**

**١ ـ (الإبتداء القبیح) دەستپێکردنی ناشیرین**

**ئەم جۆرە، دەستپێکردنە بە بەشێك کە مانا نادات وەك :**

**ــ دەستپێکردن بە (فاعل) بێ (فعل)ەکەی. نموونە : دەستپێکردن بە (نوحٌ ربِّ إنَهم) لە فەرمودەی خودا کە دەفەرمویێت (قال نوح ربِّ إنَّهم عصوني) .**

**ــ یان دەستپێکردن بە (مفعول به) بێ (فاعل)ەکەی**

**ــ یان بە (صفة) بێ (موصوف)ەکەی**

**ــ یان بە (توكيد) بێ (مؤكد)ەکەی**

**ــ یان (مضاف إليه) بێ (مضاف)ەکەی**

**٢ ـ (الإبتداء الأقبح من القبيح) دەستپێکردنی زۆر ناشیرین**

**ئەم جۆرە، دەستپێکردنە بە بەشێك کە مانایەکی پێچەوانە بدات بە دەستەوە، وەك:**

**ــ دەستپێکردن بە (اتّخَذَ الله وَلَداً) لە فەرمودەی خودا کە دەفەرمویێت (قَالواْ اتَّخَذَ الله وَلَداً)**

**ــ بەڵام ئاساییەو دروستە خوێنەر دەست بکات بە خوێندنەوە لە سەری ئایەتەوە جا هەر مانایەك بدات، وەك: (الذين هُمْ عَن صَلاتهم ساهون) (إلا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمخْلَصينَ)**

**تێبینی بۆ زانیاری زیاتر :**

**ئەگەر وقف تام بوو دەست پێکردن بەدوای ئەو (تام)ە، ئەگەر وقف كافی بوو دەستپێکردن بە دوای ئەو كافی دەبێت، ئەگەر وقف حسن بوو دەستپێکردن (قبیح) دەبێت بەمەرجێك سەری ئایەت نەبێت، ئەگەر وقف لە کۆتایی ئایەت بوو دەست پێکردن بەدوای ئەو دروست (جائزە).**

## پێرست